جەمال نەبەز

کۆبەرهەم
ژمارە (١)
بابەتی بیرکاری و بیتۆری
ژمارە (١)

# هێندێك لە كێشە بنەڕەتی یەكانی
# قوتابخانەی كوردیی سۆسیالیزم

بەرگی یەکەم



چاپی دووەم
هەولێر - کوردستان

2001

لە بلاوکراوەکانی رۆژنامەی هەریمی ژمارە (٢٠)

جەمال نەبەز

کۆبەرهەم
ژمارە (١)
بابەتی بیرکاری و پیتۆری
ژمارە (١)

# هێندێك لە کێشە بنەڕەتی یەکانی قـوتابخانەی کـوردیی سۆسیالیزم

بەرگی یەکەم

چاپی دووەم

هەولێر   باشووری کوردستان
2001

* ناوی پەرتۆك: هێندێك لە كێشە بنەڕەتی‌یەكانی قوتابخانەی كوردیی سۆسیالیزم.

* ناوی نووسەر: پرۆفیسۆر جەمال نەبەز.

* پیت چنین و نەخشەسازی: دەزگەی كۆمپیوتەری زادە.

* تیراژ: ١٠٠٠ دانە.

* چاپی یەكەم: بڵاوكراوەی رێكخراوی خوێندكارانی سۆسیالیستی كورد لە ئەوروپا (سۆكسە) لكی سوێد. چاپخانەی بنكەی چاپەمەنیی ئازاد / ستۆكهۆلم(سوێد) چاپكراوە، ستۆكهۆڵم سوێد ٢٥٩٦ك/١٩٨٤ف.

* چاپی دووەم: بڵاوكراوەی رۆژنامەی میدیا ژمارە (٢٠)، هەولێر ـ باشووری كوردستان ٢٧٠١ كوردی، ٢٠٠١ زایینی.

# چەند وشەیەك بۆ چاپی دووەم

پاش بڵاوبوونەوەی ئەم وتارانەی کە لە نێو ئەم بەرگەدا جێیان کراوەتەوە هەڤدە ساڵێك لەمەوبەر لە سوێد، خەڵکێکی یەکجار زۆر حەزیان بە خوێندنەوەی ئەم پەرتۆکە کرد، بە تایبەتی دوای دامەزراندنی **"هەرێمی ئاسایش"** و هاتنەکایەی دەسەڵاتی خۆیی لە بەشێك لە باشووری کوردستاندا؛ کە ڕێ بۆ ئەوە کرایەوە؛ هێندێك لە نووسینەکانم بە ژمارەیەکی کەم بگەنەوە کوردستان. بۆ دابینکردنی داخوازیی خوێنەران لە کوردستان، چەند کەسێك لە سلێمانی دوو ساڵێك لەمەوبەر، بە هۆی چاپخانەی ئۆفسێتی (سەفوەت)ەوە چەند سەت دانەیەکیان بە فۆتۆکۆپی لێ ڕاکێشابوو، کە ئەوەش هەر بە زوویی‌ەکی زوو لە بەردەستدا نەمابوو.

ئەوەی لێرەدا شایانی باسە ئەوەیە چاپی یەکەمی ئەم پەرتۆکە پڕە لە هەڵەی چاپی، کە کاتی خۆی هەموویم بۆ بڵاوکەرەوەکەی لە سوێد ڕاستکردبووەوە، بەڵام بە داخەوە، ئەو گوێی نەدابوو بە لابردنی هەڵەکان. ئەوجا دیارە ئەو برادەرانەی سلێمانیش کە لەبەر ئەو چاپەیان گرتبووەوە، ئەوانیش هەر بەو هەڵانەوە پێشکێشی خوێنەرەوەیان کردبوو. سەیر ئەوەیە ئەم بەڕێزانە هێندە زەحمەتیان نەدابووە بەر خۆیان تەماشایەکی بەرگی پەرتۆکەکە بکەن بۆ ئەوەی هیچ نەبێ بزانن نێوی نووسەرەکەی بە تیپی کوردیی لاتینی لەسەر بەرگەکە چۆن نووسراوە؛ تاکو ئەوانیش هەر وابینووسنەوە، بەڵکو ئەوەشیان هەر بە هەڵە و لەپاڵ وشەی ئینگلیزی‌دا نووسیبوو کە هیچ پێوەندی‌یان بەو بەرگە کوردی‌یەوە نەبوو. بێجگە لەوەش ساڵی ڕاکێشانیشی دیار نەکرابوو. لەبەر ئەوە ناچاربووم بۆ ئەم چاپە سەرلەنوێ هەڵەکان دەستنیشان بکەمەوە، هیوام وایە ئەمجارە بێ هەڵە بخرێتە بەردەم خوێنەرەوە.

بەڕاستی ئەز بۆ خۆم هەڵەی چاپیم وەك ئەوە دێتە بەرچاو کە تۆ ڕۆژێك بە درێژایی خەریکی چێشتلێنان بوویبێت بۆ میوانێکی خۆشەویست، کەچی کە ئێواری چێشتەکەت تێ کردبێ بۆی، چەندمێشێك لە شلەکەدا مەلەیان کردبێ.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئەوە بێژم کە ئەم وتارانە دیرۆکی هاتنە کایەو نێوەرۆکی قوتابخانەیەکی سۆسیالیزم لە کوردستاندا دەخەنەڕوو، واتە قوتابخانەیەکی کوردی بۆ بیروبۆچوونی ڕێبازی سۆسیالیزم کە وەك بیرۆکەی ئازادی و یەکسانیی مرۆڤ بۆیەکەمینجار بە پێی ئەو بەڵگەنامانەی لە

بەردەستدان لە ئامانجە ئاشکراکراوەکانی شۆڕشی هەژار و رووتەو چەوساوەی کورددا خۆیان نواند کە بە سەرۆکایەتیی شۆڕشگێڕی نێوداری کورد پاپەکی خوڕەمدین لە نێوان سالآنی ٨١٦/٨١٧-٨٣٧ و لە چیاکانی کوردستاندا گڕی سەند دژ بە ملهوڕیی خەلیفەی عەباسیی عارەب و سیستەمی فەرمانڕەوایی زۆردارانەی ئەو سەردەمە.

ئەم باسەی کە لەم بەرگەدا جێی گرتووە بەشێکە لە یەکێك لە زنجیرەکانی **کۆ بەرهەمەکانم** کە هیوام وایە بەرە بەرە هەموو، یان زۆربەی نووسینە چاپکراو و چاپنەکراوەکانم بگرێتە خۆی. جا لەبەر ئەوەی باسەکە لە سنووری بابەتی فەلسەفەدا دەگەڕێ؛ بۆ سەر نێوی ئەم زنجیرەیە وشەی (**بیرکاری**) و (**پیتۆری**)م بەکارهێنا، کە (**بیرکاری**) بەرامبەر (**فکری**)ی عارەبی و (**پیتۆری**)ش بۆ (**حکمة وفلسفة**) بە گونجاو دەزانم. (**پیتۆری**) وشەیەکی کوردیی خۆشناوەتی‌یە کە هێندێك کورد کردوویانە بە (**پیتۆلی**)؛ وەك چۆن (وەرام) یان کردووە بە (**وەلآم**) و (**گەمار**) یان کردووە بە (**گەماڵ**) و (**کۆمەڵ**) یان لە جیاتی (**کۆمەر**) لە (**کۆمار**)ەوە دەرهێناوە و ئێستە لەسەرمان بووە بە (**ماڵ**)!، ئەمە لە کاتێکدا کە دەنگی "ڕێ" (ڕ) لە زمانی کوردی‌دا کۆنترو رەسەنترە لە دەنگی (ڵ) و (ڵێ).

**جەمال نەبەز**

**٢٠٠١/٤/١٤ بەرلین**

# چەند وشەیەك لەجیاتی سەرەتا

مەبەست لەم چەند باسەی کە لەم بەرگەدا جیّیان کراوەتەوە ئەوەیە؛ خویّنەرەوە ئاشنایەتی‌یەك لەگەڵ سەرەتا بنەڕەتی‌یەکانی ئەو بیرەدا پەیدا بکات کە بە نیّوی **"بیری ئازادیو یەکسانیی کوردی**، یان **قوتا بخانەی کوردیی سۆسیالیزم**"ەوە، ماوەی چارەکە چەرخیّك لەمەو بەر لە کوردستاندا سەری هەڵدا، و بوو بە فەلسەفەی ریّکخراوی **"کاژیك"**؛ واتە **"کۆمەڵەی ئازادیو ژیانەوە و یەکیّتیی کورد"** کە لە ١٩٥٩/٤/١٤دا دامەزرا.

هاتنە کایەی **"بیری ئازادی و یەکسانی"** لە کوردستانیّکی، لەباری نەریّتی کۆمەلاّیەتی‌یەوە دەرەبەگانەی پیاو فەرمانیی دواکەوتوو،و لەباری رژیّمی سیاسی‌شەوە داگیرکراو و لەت لەت کراو و بیّ داوودەزگەی دەوڵەتیی سەربەخۆی،و پیّخوستی فەرمانڕەوایانی بیّگانەی سەر بە بیری ناسیۆنالیزمی شۆڤیّنیستانەی تۆتالیتاریستانەی عەرەب و ترك و فارس، شتیّکی هەروا هاسان نەبوو. نەك هەر لەبەر ئەوەی کە ئەم فەرمانڕەوا ملهوڕانە پیّیان بەسیّبەری سەری هەموو ئازادبیریّکی وەك سۆسیالیستە کوردەکاندا دەناو بەس، بەڵکو لەبەر ئەوەش بوو کە بەرەی هوردە بۆرژوای کوردیش، شان بەشانی داگیرکەرانی کوردستان بەرەبەرەکانیّی ئەم بیرە تازەیەی دەکرد. هۆی هەڵویّستی دوژمنانەی هوردە بۆرژوای گوایە رۆشنبیر ی کورد، بەتایبەتی سەبارەت بەوە بوو کە ئەم تویّکەی، ئەو دەمە لە نیّو کورددا بیّ بنکەو جەماوەرە، هەر لە نیّوەڕاستی چلەکانەوە، خۆی بە پاشکۆی ریّبازی **"ئینتەرناسیونالیزمی کۆمۆنیستیّتی"**یەوە بەستبووەوە، کە ئەوسا هەریەك سەرکردایەتی هەبوو، ئەوەش **"مۆسکۆ"** بوو. پەیتا پەیتاش پرۆپاگەندەی ئەوەی دەکرد، کە گوایە **"هەر مارکسیستە دەتوانیّ لافی سۆسیالیزم لیّ بدات و سۆسیالیزم وەك بیریّکی زانستانە هەر لە مارکسیزم دا بەدی دەکریّ و هەموو جۆرە سۆسیالیزمیّکی دی خەیالیّیە"**. جا ئەمەش وەنەبیّ هەر لە کوردستانادا وابووبیّ، بەڵکو هەموو حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهان، و زۆر بەتایبەتی حیزبە کۆمۆنیستەکانی رۆژهەلاّتی نیّوەڕاست، کە بە زۆری لە هوردە بۆرژوای گوایە **"رۆشنبیر"** پیّك هاتبوون، پیّیان وابوو هەر مارکسیستە دەتوانیّ ببیّتە سۆسیالیست. هەر **"نا مارکسیستیّکیش"** باسی **"سۆسیالیزم"**ی بکردایە، گەلیّك

نێوونەتورەی "**لاکردوو**" (منحرف) و "**ئۆتۆپی**" (خەیالی)، و ریڤیزیۆنیست (تحریفی) و "**سۆسیال شۆڤێنیست و هەلپەرست**" و هتدیان بە بالا دەبڕی.

دیارە ئەم وادانانە (فرضیة)ی مارکسیستەکان، کە گوایە "**سۆسیالیزم، وەك بیرێکی زانستانە، هەر لە مارکسیزم دا بەدی دەکری**"، دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك؛ کە یەکێکیان نەشارەزایی، یان خۆگێل کردنە لە مێژووی پەیدا بوون و دۆخگۆڕیی (تطور) بیری سۆسیالیزم،و یەکێکیشیان لەوەوە دێ کە مارکسیستەکان سەرەتای پەیدابوونی ئەوەی پێی دەبێژن "**سۆسیالیزمی زانستانە**"؛ بە بیری "**مەتریالیزمی مێژوویی**"یەوە گرێ دەدەن. جا لەبەر ئەوەیە مارکسیستەکان، هەموو ئەو بیرو رامانانە (تطورات)ی کە لە پێش پەیدابوونی مارکسێتییەوە لە سۆسیالیزم دوواون، بە "**سۆسیالیزمی خەیالی**" دەدەنە قەلەم.

تا ئەوەندەی مەسەلەکە پێوەندیی بە مێژووی سۆسیالیزمەوە هەیە، ئەوا وشەی "**سۆسیالیزم**" بۆ یەکەمجار لە سییەکانی سەدەی نۆزدەدا لە ئەورووپا هاتە کایەوە، ئەوەش وەك بیرێکی پێچەوانە بە بیری سەرمایەداری، واتە بیرێك کە هەوڵ بدات بۆ لابردنی پێوەندیی سەرمایەدارانە لەبارەی **هی خۆییی تاکیی** (الملکیة الفردیة) هۆی بەرهەم هێنان،و گۆڕینەوەی بە پێوەندییەکی نێوکۆ، واتە کردنی هۆی بەرهەم هێنان بەهی خۆییی دەوڵەت (ملکیة الدولة)، یان بەهی خۆییی کۆمەڵگە (ملکیة المجتمع)، یان بە هی خۆییی هەرەوەزگەکان (ملکیة التعاونیات)، ئەم بیرە؛ کە تەنێ پێوەندی "**بە نێو کۆیی کردنی هۆی بەرهەم هێنانەوە**" هەیە و هەتا ئەمڕۆ لای گەلێك دەستەوبەرەی کە خۆیان بە "**سۆسیالیست**" دەزانن، هەر ماوە، بەلای "**بیری ئازادی و یەکسانیی کوردی**"یەوە؛ بەسەرنجێکی تەنگەبەرانە دەدرێتە قەڵەم لە مەیدانی سۆسیالیزمدا، وەك لە شوێنی خۆی دا باس دەکرێ. لەو کاتەشەوە هەتا ئەمڕۆ، تێگە (مفهوم)ی سۆسیالیزم گۆڕانکارییەکی زۆری بەسەردا هاتووە جا ئەگەر مەبەست لە "**سۆسیالیزم**" نەهێشتنی دادۆشینی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە بێ؛ ئەوا هەوڵدان بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی وا؛ کە دادۆشینی مرۆڤی تێدا نەبێ؛ لە مێژووی پەیدابوونی وشەی "**سۆسیالیزم و مارکسیزم**" زۆر کۆنترە.

بۆ وێنە: لە "**کۆماری ئەفلاتوون**"دا باسی کۆمەڵگەیەکی پڕ لە داد پەروەری کراوە، "**ئاڤیستا و ئینجیل و قورئان**"، هەر یەکەیان لە باری سەرنجی خۆیەوە، باسی داد پەروەری کردووە، **عەلی کوڕی ئەبی تالب**، یەکەمین ئیمامی شیعەکان و چوارەمین خەلیفەی پاش پەیامبەر (٦٥٦-٦٦١) گوتویەتی: "**کاد الفقر ان یکون**

كفراً" (هەژاری هێندەی لە کفر نەگەڕاوەتەوە). هەروەها گوتوویەتی: "لا یجمع مال الا من شح او حرام" (ماڵ کۆنابێتەوە، مەگەر لە پیسکەیەتی یان حەرام). هێندەی مەسەلەکەش پێوەندی بە کوردەواری‌یەوە هەیە، ئەوا هەرچەندە وشەی "سۆسیالیزم" کوردی نی‌یەو لە زمانی کوردی‌دا تازە کوورەیە، بەڵام "سۆسیالیزم" وەك بیرێك- لە کوردستاندا شتێکی تازە کوورە نی‌یە. **پاپەکی خورەمی**، لە کوردستانی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆیەمدا ویستوویەتی **"کۆمەڵگەیەکی بێ چین"** دابمەزرێنێ، و لەم رووەشەوە شۆڕشێکی چەکدارانەی لە نێو خەڵکی رەشوڕووتی ئەو دەمەی کوردستاندا لە دژی خەلافەتی عەرەبیی ئیسلامی هەڵگیرساندووە. بیری پاپەك هێندە تەنیوەتەوە، تەنانەت کاری کردووەتە سەر **قولەڕەشەکانی بەسرە**و، وای کردووە لێیان، کە ئەوانیش شۆڕش هەڵ بگیرسێنن لە دژی خەلیفەی ئیسلام، و ئەوانیش بۆ **"کۆمەڵگەیەکی بێ چین"** هەوڵ بدەن.

ئەوانەی شارەزای مێژووی کوردن دەزانن کە **هی خۆییی خاك** (ملکیة الارض)، واتە **هی خۆییی کشتوکاڵی** (الملکیة الزراعیة) لە بەشێکی هەرە گەورەی کوردستاندا، تا نێوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم **هی خۆیی‌یەکی نێوکۆیی** (ملکیة مشاعة) بوو؛ زەویی کشتوکاڵ هی "هۆز" یان هی "چەند هۆزێك" بوو، نەك **هی تاقە کەسێك یان بنەماڵەیەك**. **هی خۆیەتیی تاکی** (الملکیة الفردیة) و **"تاپۆ"** لەلایەن سوڵتانەکانی عوسمانی‌یەوە داهێنران. بێجگە لەمانەش، لە ئەورووپا، لەسەتەکانی نێوەڕاست و لە سەتەی (١٥) بەدواوە گەلێك زاناو خێرخوازی وەك **تۆماس مۆرۆس** (١٤٨٣-١٥٣٥)و **کامپانیلا** (١٥٦٨-١٦٣٩) و **فۆرێی** (١٧٧٢-١٨٣٧)و **ژان ژاك رووسۆ** (١٧١٢-١٧٧٨)و **ئۆون** (١٧٧١-١٨٥٨)و **پرودۆن** (١٨٠٩-١٨٦٥) هەبوون، کە ئەمانە لە پێش **کارل مارکس** (١٨١٨-١٨٨٣)و **فردریك ئێنگلس** (١٨٢٠-١٨٩٥)دا، نەخشەی دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی سۆسیالیستانەیان کێشاوە. ئەمە لە باری مێژووی بیری سۆسیالیزمەوە، خۆ ئەگەر مەبەستیش ئەوەبێ کە هەر بیری سۆسیالیزمی مارکسی‌یانە **"سۆسیالیزمێکی زانستانە"**یە، و ئەوانی دی **"زانستانە نین"**؛ ئەوا مەسەلەی "زانستانە" و "نازانستانە"ی بیرێکی سیاسی، یان رێبازێکی کۆمەڵایەتی، یەکەم؛ ئەو **"سەنگ و تەزاوو"** وە دەست نیشانی دەکات کە ئەو بیرە یان ئەو رێبازە کردوویەتی بە "**پێوانە**" ی خۆی، و دووەم: "**زانستانەیی**" یان

"**نازانستانەیی**"ی بیریك، زۆرتر لە مەیدانی "**خستنە کردەوە**" و "**تاقی کردنەوە**"دا لە چەند شوێنێکی جیاوازو چەند کاتێکی جیاوازدا؛ دەردەکەوێ.

راستی‌یەکەی، ئەوەی تا ئێستە یارمەتی مارکسیستەکانی داوە، بۆ ئەوەی بتوانن ئەم لافە لێ بدەن، بەتایبەتی لە "**جیهانی سێیەم**" و "**جیهانی چوارەم**"دا، ئەوەیە جیهانی سەرمایەداریی رۆژاوا، زۆر بەتایبەتی، لە رۆژانی کارل مارکسەوە تا ئێستە، بەهۆی ناکۆکی‌یەکانی نێوخۆوە، کە دوو جەنگی جیهانیی ماڵوێرانکەری لێ پەیدابوو، و هەروەها لە رێی کۆلۆنیزە کردن و تاڵان کردنی ماڵ و سامانی وڵاتەکانی رۆژهەڵات، و دیل کردن و بندەست کردنی گەلەکانی‌یەوە، وێنەیەکی دێوڕەنگانەی بۆ خۆی لە نێو گەلانی ژێر دەستەدا دروست کردووە، و لە هەمان کاتدا فەرمانڕەوایانی ئەو جیهانە سەرمایەدارە، بە هەموو جۆرێك بەربەرەکانێی بیری مارکسیزم و کۆمۆنیزمیان کردووە، و بەم بەربەرەکانی‌یەش، ناویستە (عن غیر قصد)، رێزو پیرۆزی‌یەکی زۆریان بۆ مارکسیزم و کۆمۆنیزم دروست کردووە، جا لەبەر ئەوەی بەشێك لە فەرمانڕەوایانی جیهانی سەرمایەداری، کە نێویان ناوە "**جیهانی ئازاد**"، لەوانە بوون و لەوانەن کە بە "**سۆسیال دێموکرات**" ناسراون؛ کە هێندێکشیان خۆیان بە "**سۆسیالیست**" یان "**دێموکرات سۆسیالیست نێو دەبەن، دیارە ئەمە پتر ئاوی بەسەر ئاشی "سۆسیالیستە مارکسی‌یەکان**"دا کردووە؛ چۆنکە ئەوەی هێندێك لەم هوردە بۆرژوا سۆسیال دێموکراتە ئەورووپایی‌یانە، بە کردەوە کردوویانەو دەیکەن بەرامبەر چینی کرێکار و هەژار و رووتەی وڵاتانی دواکەوتوو و گەلە بندەستەکانیان، لە رێی پەیمان بەستنەوە لەگەڵ رژێمە تۆتالیتێرو دیکتاتۆری‌یەکانی ئەو وڵاتانە، هیچ چەپی نی‌یە لە کردەوەی ئەو حیزب و کۆمەڵە کۆنزەرڤاتیڤانەی، کە راستەوخۆ و بێ پەردە بەربەرەکانێی هەموو بیرێکی سۆسیالیستانە دەکەن، و ئەمەش بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەڵگەو بیانووی دایە دەست مارکسیستەکان، کە هەتا پاش جەنگی جیهانیی دووەم هەر لە تاکە وڵاتێکدا، واتە هەر لە یەکێتیی سۆڤێتدا، فەرمانڕەوابوون و هێشتا لە هیچ وڵاتێکی دی‌دا نموونەی فەرمانڕەوایی‌یان نەبینرابوو، کە هەر خۆیان بە "**سۆسیالیستی راستەقینە**" و "**نوێنەری پرۆلیتاریا**"بزانن؛ بوونی شورەیەکی ئاسنین بە دەوری وڵاتی "**تاقانەی سۆسیالیست**" بۆ ئەوەی لە "**مەیدانی خستنە کار**"دا رەنگ و رووی دەرنەکەوێ بۆ خەڵکی. بەڵام دروست بوونی چەند دەوڵەتێکی مارکسیستانە بە نێوی "**دێموکراتی گەلێر**"ەوە پاش جەنگی

جیهانیی دووەم لە ئەورووپای رۆژهەلاتدا، کە زۆربەی زۆریان بە یارمەتیی سوپای سۆڤێت دامەزران، ئەوجا مردنی **ستالین** لە ساڵی ۱۹۵۳دا، و هاتنە سەرکاری چەند سەرکردەیەك بەتایبەتی (**خرۆشێف**) کە دەروازەی خڕداخراوی سۆڤێتیان لە پڕ کردەوە بەرووی جیهانی سەرمایەداریی ئەهلیی رۆژئاوادا، و کەوتنە بەستنی پێوەندیی بازاڕکاری بە نێوی "**پێکەوە ژیانی ئاشتی خوازانە**"وە، دوای ئەوەش؛ چاوگێڕانەوە بە سەنگ و تەرازووی مارکسیستانەی کلاسیکی دا، بەتایبەتی لابردنی "**دیکتاتۆرێتیی پرۆلیتاریا**"، بە کورتی سەرکەوتنی رێبازی "**دەستکاری کردن**" لە بیری مارکسێتیدا، زێتر رێی کردەوە بۆ گومان کردن لە "**زانستایەتیی**" بیری سۆسیالیزمی مارکسیستانە.

شایانی باسە، کە رەخنەگرتن لە بیری مارکسێتی لە کوردستاندا، بۆ یەکەمجار، لە نێوەڕاستی پەنجاکاندا دەستی پیێ کرد، بەتایبەتی پاش مردنی **ستالین**. ئەو کوردانەی رەخنەیان لە بیری مارکسێتی دەگرت، لە پێشەوە، لە وتووێژی تیۆرییانەوە دەستیان پیێ نەکرد، بەڵکو جاریێ کارو کردەوەی سەرکردەکانی یەکێتیی سۆڤێتیان لەگەڵ رامانەکانی (تصورات) مارکسێتیدا بەراورد دەکرد، و لە تاقی کردنەوەی مێژووی کورد و گەلانی ژێردەستەی دییەوە لەگەڵ "**دەوڵەتی پرۆلیتاریا**"؛ وێنەی زیندوویان دەسختە بەرچاو. بۆ نموونە زۆر بە سادەیی، دەیانگوت: **دەبیێ قسە و کردەوە وەك یەك بن**، واتە "**تیۆری**" و "**پراکتیك**" لەگەڵ یەك "**جووت بەرامبەر**" بن. ئەوجا دەیانگوت: جا ئەگەر ئەمە وایە؛ چۆن دەبیێ ستالینێك کە لاف "**پشتگیریی هەموو گەلانی ژێردەستەی جیهان**" لیێ دەدات لە دژی "**ئیمپریالیزم**" و "**دەستندە خۆرەکانی**"، هەر ئەم ستالینە بچیێ پشت بکاتە گەلێکی ژێر دەستەی وەك کورد و کۆمارە گچکەکەی مەهاباد، و رێك بکەویێ لەگەڵ دەوڵەتی شای ئێران، کە هەر بە رەئی ستالین و لایەنگرەکانی؛ نۆکەری ئیمپریالیزمی سەرمایەداری و نوێنەری چینی دەرەبەگ و کۆنەپەرستێتییە، و هەر بە پێی ئەو رێك کەوتنە لەشکر بکێشێتەوە لە کوردستان، لەبەر خاتری چنگ کەوتنی ئیمتیازی نەوت؟ یان ئەوەی، ستالین بچیێ لە تاران لەگەڵ پیاوانی وەك **چەرچل و رۆزفلت**، بەیانی وا دەربکات وەك **بەیانی سیێ قۆڵیی تاران** کە لە ۱۹۴۳/۱۲/۱دا دەرکرا، بۆ رێزگرتن لە رژێمی شاهەنشاهی ئێران و لە دژی بەرژەوەندیی گەلانی ژێر دەستەی **ئازربایجان و کوردستان**، ئەمە لە کاتێکدا کە هەر ستالین خۆی؛ **چەرچل و رۆزفلت** بە نوێنەری سەرمایەداران و خوێنمژانی پرۆلیتاریای جیهان بداتە قەڵەم؟ ئایە

دەبێ بیرکردنەوە و ئامانجی "**سۆسیالیستێک**"ی وەک **ستالین**؛ هەروەک بیرکردنەوە و ئامانجی کابرایەکی سەرمایەدار بێ، واتە هەر بۆ سووت و قازانج هەوڵ بدات؟. سۆسیالیستە کوردەکان، ئەمجا نەختێک دەچوونە دواوە بۆ رابوردوو و دەیانگوت: چۆن دەبێ **لێنینێک** کە بە دامەزرێنەری یەکەمین "**دەوڵەتی پرۆلیتاریا**" دەدرێتە قەڵەم، بچێ، پشت بکاتە گەلێکی جۆتکاری هەژاری وەک کورد، و ببێ بە هاورێ و هاوکاری هوردە بۆرژوایەکی دیکتاتۆری فاشیستی وەک "**کەمال ئەتاترک** و **رەزا پەهلەوی**؟" ئەمجا جارێکی دی دەهاتنەوە پێشێ و دەیانگوت: چۆن دەبێ کابرایەکی وەک "**خرۆشێف** رێزی **جەمال عەبدولناسرێکی ناسیۆنالیستی عەرەبی**، **لە کۆمۆنیستێکی عەرەبی میسری یان سووریایی یان عێراقی**" لا بەرزتر و زێتر بێ؟ جا کاتێک کە ئەم رەخنانە دەگیران، ئەو پرسیارەی دەهاتە پێشەوە؛ ئەمە بوو: ئایە ئەم هەڵوێستانەی "**لێنین و ستالین و خرۆشێف**"، سەبارەت بەوەیە کە ئەم سەرکردانە بیروباوەڕی مارکسیێتییان باش نەخستووەتە مەیدانی کارەوە، یان ئەوەتە بیروباوەڕی مارکسیێتی، خۆی لە خۆیدا، ناتەباییەکی لە نێوزگدایە، کە بیەوێ و نەیەوێ، هەر دەبێ بکەوێتە سەر ئەم رێیەی ئەمرۆ پێی دا دەڕوا؟.

وتووێژ لەسەر ئەم پرسیارە و هەوڵدان بۆ وەرامدانەوەی، بەرە بەرە بوو بە رەخنەگرتن و گومان کردن لە بیری مارکسیزم خۆی، و لەو "**پیرۆزی**" و "**نەگۆڕی**"یەی کە "**سۆسیالیزمی مارکسیستانە**" لە کوردستاندا پەیدای کردبوو.

بنچینەی تیۆری بیری سۆسیالیستە کوردەکان، پشتی بە **کولتووری کۆنی کورد** بەستبوو، کە بەشێکی ئەمە لە "**یەکێتی**"ی سێ کوچکەی "**بیرو قسەو کردەوە**"ی **زەردەشتدا** دەبینرێ. پەیامبەرو رێپێشاندەری کورد و ئێرانییە کۆنەکان، و فەیلەسووفی رۆژهەڵات؛ **زەردەشت**، بۆ وەدەست دانی ئامانجی ئاینەکەی خۆی، فەلسەفەیەکی سێ کوچکەی بنیات ناوە: "**بیری باش و وتەی باش و کردەوەی باش**". بە پێی ئەم فەلسەفەیە؛ هەموو "**بیرێکی باش**" ئەنجامێکی باشی نابێ، ئەگەر "**باش دەرنەبڕێ**" و "**باش نەخرێتە مەیدانی کار**"ەوە. دەلێرەدا "**بیرو وتە و کردەوە**"، دەبێ پڕ بەپڕی یەک بن و تەڤی یەک بگونجێن. جا ئەگەر ئێستە، وتووێژ لەسەر ئەوە پەیدا ببێ کە "**باش**" چییە و "**ناباش**" چییە، ئەوا هیچ کێشەو بەرەیەک نابێ لەسەر ئەوە پەیدا ببێ، کە بیرەکە خۆی، و دەربڕینی بیرەکە، و خستنە کاری بیرەکە، لەگەڵ یەک دەبێ کۆک بن، واتە بۆ نموونە ئەگەر بیرێک لاڤی ئەوەی لێدا کە بەرزترین بیری مرۆڤایەتییە و لە خزمەتی هەژار و

رووته و زەحمەتکێش و بەشخوراو دایە، نابێ هەر بە "**وتە**" و "**لەسەر کاغەز**" وابێ، بەڵکو دەبێ ئەوە "**بەکردەوە**" ئیسپات بکات. جا هەڵگرانی "**بیری ئازادی و یەکسانیی کوردی**" بەم تەرازووە سێ تایی‌یە لە "**سۆسیالیزم**" کۆڵینەوە.

جارێ بەر لە هەموو شتێك، "**هاوبیرانی ئازادی و یەکسانی**" لە کوردستاندا، دەیان پرسی و دەیانگوت: ئایە "**سۆسیالیزم**" هەروەك دیانەتی (المسیحیة) و موسوڵمانەتی و جوولەکەیەتی و زەردەشتێتی، ئاینێکی پیرۆزە، کە لە ئاسمانەوە نێررابێ بۆ ئادەمزاد، و چۆن ئەوانەی باوەڕیان بە ئاینێکی ئاسمانی هەیەو، بێ رەخنە و رەخنەکاری، خۆیان دەخەنە خزمەتی ئاینەکەوە، و جاری واش هەیە؛ خۆیان دەدەن بە کوشت لەسەری، هەروەهاش دەبێ "**مرۆڤی سۆسیالیست**" بەو چاوە تەماشای سۆسیالیزم بکات، و بێ رەخنەو رەخنەکاری، و بێ قرەو برە، خۆی فیدا بکات بۆی یان ئەوەتە سۆسیالیزم، خۆی لە خۆیدا، رێیەکە، و بیری مرۆڤ دۆزیویەتەوە بۆ هاسان کردنی ژیان، و دەبێ لە خزمەتی مرۆڤدا بێ، خۆ ئەگەر پیرۆزی "**قدسیة**" یەکیشی بۆ حسێب بکرێ، ئەوە هەر لەوەوە دێ کە خزمەتی مرۆڤ دەکات، چۆنکە هەرچی‌یەك مرۆڤ دروستی کردووە، ئەوا هەر ئەوەندە پیرۆزە تا لە خزمەتی مرۆڤدایە، و هەر کاتێك لە سنووری خزمەتی مرۆڤ چووە دەرەوە؛ "**پیرۆزی**" نامێنێ. بۆ نموونە: مێشکی مرۆڤ، هێزی ئەتۆمی دۆزیوەتەوە، و ئەتۆمیش هەر هێندە باشە کە خزمەتی مرۆڤ بکات، بەڵام کە بوو بە هۆیەك بۆ قڕکردنی مرۆڤ، دەبێتە شتێکی خراپ. بە کورتی، لەمەوە قوتابخانەیەکی بیری تازە لە کوردستاندا دروست بوو، بە نێوی "**قوتابخانەی ئازادی و یەکسانی**" یان "**قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم**"ەوە. هەڵگرانی ئەم بیرە تازەیە هەر لە سەرەتاوە بەم جۆرەی خوارەوە بیریان لە "**سۆسیالیزم**" دەکردەوە و دەیانگوت:

ئەگەر باوەڕ بهێنین بەوەی کە خزمەت کردنی مرۆڤ ئامانجە، و بیری سۆسیالیزم هۆیەکە بۆ ئەو ئامانجە، دەبێ باوەڕ بەوەش بهێنین کە مرۆڤ نابێ ببێتە بەندە و کۆیلەی بیری سۆسیالیزم، بەڵکو دەبێ بیری سۆسیالیزم لە خزمەتی مرۆڤ دابێ. کە هاتینە سەر ئەمەش، دەبێ بێینە سەر ئەوەی، کە بیری سۆسیالیزم دەبێ بەر لە هەموو شتێك خۆماڵە سروشتی‌یەکانی مرۆڤ بگرێتە بەرچاو، و رێزیان لێ بنێ، و لە خزمەتی هێنانەدی ئەو مافە بنچینەیی‌یانەدا بێ کە لەو خۆماڵە سروشتی‌یانەوە پەیدا دەبن. دەیەکێك لەو خۆماڵە گشتی‌یە سروشتی‌یانەی ئادەمزاد "**ئازادی**"یە. **هەموو مرۆڤێك**

**لێرەمەبەست لە مرۆڤ، تەنێ مرۆڤی ژیرە- ئازادە،** لەو رۆژەوە کە لە دایك دەبێ، تا ئەو رۆژەی لە جیهان دەردەچێ. ئەوجا یەکێك لە تایبەتی‌یەکانی **مافی سروشتی "الحق الطبيعي"** ئەوەیە، کە ئەو مافە بەشێکە جیا ناکرێتەوە لەو **"شتە خۆی"**. بۆیە؛ نەدەبەخشرێ و نەدەکڕرێ و نەدەفرۆشرێ. لەبەر ئەوە، لەبارەی سەرنجی **"بیری ئازادی و یەکسانیی کوردی"**یەوە، دەبێ بیری سۆسیالیزم، هەر لە بنەڕەتەوە و بە کردەوە؛ خزمەتی سەرەتای **"ئازادیی مرۆڤ"** بکات، بۆیە هاوبیرانی **"بیری ئازادی و یەکسانیی کوردی"** دەیانگوت: "ئێمە یەك کەلێرەوە لە سەرەتای ئازادی‌یەوە- دەست پێ دەکەین، کەسێك ناتوانێ بێ و پێمان بسەلمێنێ؛ کە سۆسیالیزم هەر بریتی‌یە لە تێربوونی سك و بەجێ گەیاندنی پێویستی‌یە سەرەتایی‌یە ماددی‌یەکانی ژیان، وەك جلوبەرگ و خانوو و کەلوپەلی رابواردن. بە کورتی **"قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم" هەر زگ تێری و پارس نەکردن بە "سۆسیالیزم" نازانێ.** ئەمەش شتێکی رەوایە. چۆنکە رەنگە ئەوانەی کە لە هێندێك ولاتی وادا دەژین، کە گەلەکانیان هەژار کراون، و هی وایان هەیە کە سالێ جارێکیش تێر بە زگی خۆیان ناخۆن، باوەڕ نەکەن کە سەگ لە هێندێك لە ولاتەکانی رۆژئاوادا، هێندە بەڕێزن؛ هەموو رۆژێك گۆشتی تازەیان دەدرێتێ، و بەسابوون و دەرمان پاك و تەمیز دەشۆرێن، و زوو زوو دەبرێنە لای دوکتۆر، و بە شەو جێی گەرم و گوڕیان هەیە، بەلام **"سەگ هەروەك سەگ"** تەماشا دەکرێن، واتە بە پێی هەوەس و ئارەزووی خاوەنەکانیان پەت دەکرێتە ملیان، و ئەگەر بە دلی خاوەنەکانیان نەجوولانەوە، ئەوا دەدرێنە بەر زللەو شەق، و دەبێ هەر بقروسکێنن بۆ خۆیان. هەر لە ولاتی کوردەواریی خۆشماندا زۆر مەلی جوانی وەك بلبل و کەو هەن، هەموو رۆژێك ئاوودانی تەواویان دەدرێتێ، بەلام جێیان هەر قەفەزەکەیە و لە چارچێوەی ئەو قەفەزە تەنگەدا نەبێ، بە دەگمەن دەتوانن ئازادانە بجوولێنەوە. **"مرۆڤ"** چوار پێ و مەل نی‌یە، بەوە دابین بکرێ، کە بەلێ، جۆرە رژێمێك هەیە زگت تێر دەکات، و نایەلێ برسی بیت؛ تۆش دەبێ بەرامبەر بەوە واز لە ئازادیی خۆت بهێنیت، و ئازادیت بکەیتە قوربانی سکت و ئەوەش نێو بنێیت **"سۆسیالیزم"**. لە ولاتەکانی ئەورووپای رۆژهەلاتدا، کە بیری مارکسیزم بە کردەوە خراوەتە کار، ئەمە باوە. کە قسەش دەکەیت لەگەڵ ئەوانەی سەر بەو رژێمەن، و دەبێژیت بۆچی لەو ولاتانەدا سەربەستی نی‌یە، و کەس ناتوانێ رەخنە بگرێ و کەس ناتوانێ بە سەربەستی بێتە دەرەوە لە ولات و کەس ناتوانێ رێکخراوێکی سیاسیی جیا لە

ڕێکخراوی دەوڵـەتی دروسـت بکـات، دەسـتبەجێ وەرامـت دەدەنـەوە: "ئـای! ئەوەتە هەموو خەڵك تێرو تەسەلن، و پێویستی‌یە سەرەتایی‌یەکانی ژیان، وەك نان و شیر و پەتاتە و هێلکە؛ هەرزانن، کرێـی خانوو زۆر کەمـە، بلیـتی پـاس و ترامـوای و شـەمەنەفەر یـەکجار هەرزانـە". بـەڵێ! ئـەم قسـەیە، ئـەوەش تـا هەندازەیەك، نەك بە تەواوی، راستە. بەڵام ئەمە وەرامی ئەو پرسیارە نی‌یە کە دەبێژێ: **بۆچی دەبێ ئازادی بکرێ بە قوربانی زگ تێری؟**

جا هاوبیرانی **"قوتابخانەی کوردیی سۆسـیالیزم"** دەبێـژن: کە رژێمێك وابێ، واتە ئەوانەی بە **"جەماوەری گەل"** دادەنرێن؛ لەبەر ئەوەی **"زگیان تـێره"**، ئێدی نابێ بەرامبەر کاربەدەستانی وڵاتەکەیان دەم بکەنەوە، مانای وایە **"دوو چین"** لە کۆمەڵگەدا هەیە، یەکێکیان چینی ناندەر، کە کاربەدەستانن، و یەکێکیشـیان چینی نان وەرگـر، کـە گەلەکەیـە، و لـێرەدا **"چیـنی نـاندەر"** مـافی ئـازادیی قسەکردن و بڕیاردان و هەڵسووڕاندنی کاروبار و ناندانی هەیە، و **"چیـنی نـان وەرگـر"**یش مـافی ئازادیی قسەکردن و بڕیاردان و کارهەڵسووڕاندن و نـاندانی نی‌یـە. ئـەوجا کـە مەسـەلە وابـێ، و ئەمـەش ئـەنجامی خسـتنەکاری بـیری سۆسـیالیزمی مارکسـی‌یانە بـێ، گوایـە دەبـێ رژێمێکـی وا چـی لـە رژێمـی سەرمایەدارێتی باشتر بێ. لە رژێمی سەرمایەدارێتی‌دا، سەرمایەداران چۆنکە نانی ئەوانەیان بەدەستە کە سەرمایەی پارەو هۆی بەرهەم هێنانیان نی‌یە، هەر لەبەر ئەوەیە کە **"فەرمانڕەوان"**، بێ سەرمایەکانیش ئەوانەن کە فەرمان دەکرێ بەسـەریاندا. بـە کورتـی: لەمـەدا دەردەکـەوێ، کـە ئامـانجی سۆسـیالیزمی مارکسی، بە کردەوە؛ مسۆگەر کردنی نان و ژیانی رۆژانەیە، و مسۆگەر کردنی نـانی رۆژانـەش بـە **"کۆمەڵگـەی دادپـەروەری"** دەداتـە قەڵـەم. هـەر لەمەشـەوە دەردەکـەوێ کـە مارکسیسـتەکان، واتـە ئەوانـەی خۆیـان لـەو بـاوەڕەدان کـە **"پێوەندی‌یـەکانی بەرهـەم هێنـان"** وەك **"ژێرخـانێکی کۆمەڵگـە"**، هـەموو جـۆرە پێوەندی‌یەکی **"سەرخانانە"** لە قانوون و نەرێت و رەوشتو خوو دەست نیشـان دەکات، هەر خۆیان، بە کردەوە، لـەو دەوڵەتانـەدا کـە دروستیان کردووە؛ ئەو پێوەندی‌یە کۆنەی بەرهـەم هێنانیـان، لـە بنەڕەتـەوە، وەك خـۆی هێشـتووەتەوە، ئەگەر چی لە **"دەستێکی ئەهلی"**یەوە داویانەتە **"دەسـتێکی دەوڵـەتی"**. هـەر لەبەر ئەوەشە ئەو قانوون و نەرێت و رەوشتو خوو و بیرۆکراتیێتیی دەزگەی دەوڵـەتی و چـاو برسـێتیی بازرگانانەیـەی، کـە لـەژێر سـایەی رژێمـی سـەرمایەداریی ئەهلی‌دا هەبوون، لە ژێر رژێمی **"سەرمایەداریی مۆنۆپۆلیستانەی دەوڵـەتدا"**، هـەر

وەك جاران ماونەتەوە، چۆنكە "**پێوەندییەکانی بەرهەم هێنان**"، تەنێ لە باری "**شێوە**"وە هاتوونەتە گۆڕان، نەك لە باری "**نێوئاخن**" و "**جەرگە**"وە.

"**مەسەلەی سۆسیالیزم**" بەلای هەڵگرانی "**بیری ئازادی و یەکسانیی کوردی**"یەوە، هەر مەسەلەی "**نان**" و پێداویستییەکانی ژیانی رۆژانە، یان "**دۆزینەوەی کار**" نییە بۆ هەموو کەسێك. **بە کورتی مەسەلە هەر مەسەلەی "ئابووری" نییە.** مەسەلەکە گەورەترە لە مەسەلەی "**ئابووری**" و گەورەترە لە مەسەلەی "**پێوەندییەکانی بەرهەم هێنان**". مەسەلە مەسەلەی "**ئازادی**"یە، کە "**مەسەلەی ئابووری و پێوەندییەکانی بەرهەم هێنان**"، "**بەشێکن لە مەسەلەی ئازادی**" نەك "**هەموو ئازادی**".

هاوبیرانی "**قوتابخانەی ئازادی و یەکسانیی کوردی**"، کە "**سۆسیالیزم**" بە "**یەکسانیی لە ئازادی**"دا دەزانن، دیارە چارەسەرکردنی مەسەلەی ئابووری بەتەنێ، واتە، تەنێ کەم کردنەوەی جیاوازیی ئابووریی نێوان هەژارو دەوڵەمەند، بە "**سۆسیالیزم**" نازانن. واتە؛ ئەگەر بێتو تەنانەت کۆمەڵگەیەکیش دروست ببێ، چینی ئابووری تێدا نەمێنێ، بەمەرجێ جیاوازییەکانی دی مابن، ئەوا ئەو کۆمەڵگەیە بە "**کۆمەڵگەیەکی سۆسیالیستی**" ناداتە قەڵەم. ئەو رژێمانەی کە جیاوازیی ئابووری کەم دەکەنەوە، بەڵام لە ئازادیی گەل دەگرنەوە، بە "**سۆسیال تۆتالیتێر**" نێو دەبات.

ئەم هەڵوێستەی کە هاوبیرانی "**قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم**" هەیانە بەرامبەر "**سۆسیالیزمی مارکسی**"، ئەوە ناگەیەنێ کە بەلای بیری سەرمایەدارێتیدا دادەشکێنن. نەخێر. بۆچوونی ئەم قوتابخانەیە بەرامبەر سەرمایەدارێتی زۆر رۆنەو بەم جۆرەی خوارەوەیە:

لەبەر ئەوەی جیهانی سەرمایەداری، و بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی دەوڵەتەکانیان لەسەر بیری لیبەرالیزم دەڕۆن بەڕێوە، لاف ئەوە لێ دەدەن کە خەڵکی هەموو ئازادن و ئەمەش بەوە پێشان دەدەن کە گوایە خەڵکی لەبەردەم قانوون و لەبارەی پەیمان بەستنەوە لەگەڵ یەکدیدا، ئازادن، و کەس نییە زۆر لە کەس بکات و کارێك بسەپێنێ بەسەریدا کە بە دڵی نەبێ، و هەموو دانیشتووانی وڵاتێك بێ جیاوازیی زمان و رەگەزو توخم و ئاین و بیروباوەڕی سیاسی، لەبەردەم قانووندا وەك یەکن؛ لەبەر ئەوە هەر کەسە ئازادە کە کاربکات و پارە پەیدابکات و دەوڵەمەند ببێ، و ئەمەش وا لە رژێمی لیبەرالیزم دەکات کە بنەماکەی لەسەر بنچینەی "**هی خۆییی تاکی**" (الملكية الفردية)

وەستاوە لاڤ ئەوەش لێ بدات کە "**سووت پەیداکردن**" هاندەرێکی بنچینەییی گرنگە بۆ کارکردن. چۆنکە وەك دەبێژێ- ئەگەر مرۆڤ، سووتی لە کاری خۆی دەست نەکەوێ، هاندەرێك نامێنێ بۆ کارپێکردنی. لێرەدا سەرمایەدارێتی مەسەلەی "**ئیندیڤیدوالیزم**" و "**دیمۆکراسی**" تێکەڵ بە مەسەلەی "**بازاڕی ئازاد**" دەکات، و دەیانکاتە یەك بە نێوی "**لیبرالیزم**"ەوە. بەڵام "**قوتابخانەی ئازادی و یەکسانیی کوردی**" دەبێژێ: راستە رژێمی سەرمایەدارێتی باسی ئازادی دەکات، بەڵام ئازادی لەچی‌دا؟ ئازادی لە بوونی ماڤ "**تەماع**"دا، و لە بوونی ماڤ "**رکەبەرایەتی**"دا لەگەڵ یەك بۆ گەیشتنە نێچیری قەڵەوتر و پارووی زلتر، بە کورتی سەرمایەدارێتی پارێزگاری لە ئازادیی مرۆڤ دەکات، بەڵام لە چ ئازادی‌یەك؟ لە ئازادیی دژایەتی کردنی وەك یەکی‌دا. بە واتەیەکی دی: سەرمایەدارێتی ئازادی لە دژایەتی کردنی یەکسانی‌دا دەبینێ. جا لەبەر ئەوەی یەکسانی مانای ئازادی‌یە و نایەکسانی مانای ناوەك یەکی‌یە لە بوونی ئازادی‌دا (تەماشای وتاری "**ئازادی و دەسەڵات**" بکە)، دیارە سەرمایەدارێتی؛ ئازادیی بەشێکی کەمی کۆمەڵگە؛ لە دژایەتی کردنی بەشێکی زۆری کۆمەڵگەدا دەبینێ. ئەمجا بەپێچەوانەی ئەو لێکدانەوەیە- "**بازاڕی ئازاد**" خستنە کاری بیری "**ئیندیڤیدوالیزم**" نی‌یە. چۆنکە لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ: ئایا ئەو پێوەندی بەرهەم هێنانەی ئەو بازاڕەی هێناوەتە گۆڕێ، بەڕاستی پێوەندی‌یەکی ئازاد بووە؟ **ئیندیڤیدوالیزم؛ مانای بەکارهێنانی ئازادی‌یە بەو شێوەی ئەو کەسە بۆ خۆی بە پەسەندی دەزانێ، نەك بەکارهێنانی ئازادی لە دژی ئازادی.**

"**بیری ئازادی ویەکسانیی کوردی**"؛ "**ئازادی**" و "**یەکسانیی**" دەبەستێت بەیەکەوە، و وەك "**تەواوکەری یەك دی**" تەماشایان دەکات و دەبێژێ "**ئازادی بێ یەکسانی**" نابێ و "**یەکسانی بێ ئازادی**" نایەتە کایەو لەم بارەیەشەوە، بە دووای هۆکاری "**نایەکسانی**"دا دەگەڕێ، و لەو بیروڕایانە دەکۆڵێتەوە کە لەبارەی هۆکاری نایەکسانی‌یەوە دەربڕاون. بۆ وێنە: کە تەماشای رەئی **ژان ژاك رووسۆ** دەکات بەتایبەتی لەوەدا کە لە ساڵی ١٧٥٥دا لە نامیلکەی "Discours Sr inegalite" "**وتار لەسەر نایەکسانی**"دا باسیکردووەو، پێی وایە: "**نا یەکسانی بەهۆی هی خۆییی تاکی‌یەوە دێتە گۆڕێ**"؛ دەبێژێ: ئەمە هەموو کاتێك راست نی‌یە. چۆنکە بەتاقی کردنەوە دەرکەوتووە کە لە هێندێك وڵاتدا، هی خۆییی تاکی نەماوە، و کراوە بە هی خۆییی دەوڵەت و، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا یەکسانی لە نێو کۆمەڵگەدا پەیدا نەبووە، و بگرە نایەکسانی لە جاران بەهێزتر

بووه. ئەمجا کە دێتە سەر ئەو هیپۆتێزەی فردریك ئەنگلس کە لە کتێبی **"دژی دیورینگ"** Anti-Duhringدا باسی دەکات و دەبێژێ **"دابەشکردنی کار دەبێتە هۆی دروست کردنی چین"**، ئەمەش بەراست نازانی چۆنکە دابەشکردنی کار لە هەموو کۆمەڵگەیەکی شارستانێتیدا بووە و هەیە و دەبێ و ، بەم پێیە دەبێ نایەکسانی هەتا هەتا هەر بمێنێ. **"قوتابخانەی بیری ئازادی و یەکسانیی کوردی"** پێی وایە، کە هۆی راستەقینەی نایەکسانی، لە هەموو روویەکەوە، چ ئابووری و چ نا ئابووری، دەگەڕێتەوە بۆ نایەکسانی لە بوونی دەسەڵاتدا. بە وتەیەکی دی: نایەکسانی، لە نەبوونی دەسەڵاتی وەك یەکەوە پەیدا دەبێ. واتە؛ ئەگەر دوو کەس یان دوو دەستەیە یان دوو بەرە یان دوو هێز یان دوو دەوڵەت؛ بەقەدیەك دەسەڵاتیان هەبێ، ئەوا ئەو دوو کەسە یان ئەو دوو دەستەیە یان ئەو دوو بەرەیە یان ئەو دوو دەوڵەتە دەبنە هاوشانی یەك، واتە **"یەکسان"** دەبن. جا وەك لە وتاری **"ئازادی و دەسەڵات"**دا رۆنمان کردووەتەوە، کە بوونی ئازادی؛ مانای بوونی دەسەڵاتە بەقەدەر ئەو ئازادییە، و بوونی دەسەڵاتیش، مانای ئازادییە بەقەدەر ئەو دەسەڵاتە کەواتە هەر بەم پێیە، بۆ ئەوەی مرۆڤی یەك کۆمەڵگە، وەك یەك ئازادبن، دەبێ دەسەڵاتی وەك یەکیشیان هەبێ. جا لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا؛ رێی جیاوازیی دەسەڵات لە نێوان تاکە تاکەی کۆمەڵگەدا بەرەڵلایە، دیارە کە لە کۆمەڵگەیەکدا دەسەڵاتی جۆر جۆر هەبوو، ئەوا پلەی ئازادیش جۆرجۆر دەبێ و وەك یەك نابێ؛ لەبەر ئەوە هەموو جۆرە باس کردنێکی ماف وەك یەك و ئازادیی وەك یەك **"لەبەردەم قانوون"**دا، گشتی درۆیە.

هەر بەم پێیە، **"قوتابخانەی بیری ئازادی و یەکسانیی کوردی"** لەو باوەڕەدایە کە ئازادی لە کۆمەڵگەیەکی نایەکساندا ناهێنرێتە دی. واتە ئازادی هەر لە کۆمەڵگەیەکی یەکساندا شێوا **"قابل"**ی بوونە. چۆنکە لە کۆمەڵگەیەکدا کە دەسەڵاتی جیا جیا هەبێ، دیارە پلەی ئازادیی تاکە تاکەی خەڵکەکە وەك یەك نییە. جا لەبەر ئەوەی ئازادیی مرۆڤ، کەموزۆری هەڵ ناگرێ، و هەر یەك هەندازەشی هەیە؛ دیارە هەموو مرۆڤێکی ژیر، مافی ئازادی وەك مرۆڤێکی ژیری دی هەیە، بێ کەمو زیاد. لەبەر ئەوە ئەوەی دەبێژێ مرۆڤێك یان گەلێك یان دەستەیەك، مافی ئازادییان دەبێ زۆرتربێ لە مرۆڤێك یان گەلێك یان دەستەیەکی دی، دیارە ئەو کەسە باوەڕی بە **"یەکسانیی مرۆڤ"** نییە. و هەر کەسێکیش باوەڕی بە یەکسانیی مرۆڤ نەبێ؛ باوەڕی بە ئازادیی مرۆڤ نییە.

ئازادی و یەکسانی  بە پێی ئەم بیرە - وەك دوو دیوی پارچە پارەیەك وانە. پارەش ناچێ هەتا هەر دوو دیوەکەی نەخشی لەسەر نەبێ. کەواتە ئازادی بێ یەکسانی نابێ، و یەکسانیش بێ ئازادی بوونی نییە. جا ئەگەر بیری ئازادی بە تیۆری دابنێین، دەبێ یەکسانی دابنێین بە پراکتیك. واتە هەر کاتێك بیری ئازادیی لای مرۆڤ هاتە مەیدان، بە کردەوە خۆی لە یەکسانیی مرۆڤ دادەنوێنێ.

جا وەك لەمەوبەر گوتمان؛ دەسەلات هەر **"دەسەلاتی ئابووری"** نییە، بەڵکو هەر جارەی جۆرە هێزێکە. هی خۆیی ئابووری **"بەرهەمێکی دەسەلات"**ە، نەك **"هەموو دەسەلات"**. بۆ وێنە ئەو هەژارە رەشوپووتەی کێردێکی زلی بەدەستەوەیە، دەتوانێ لە کاتێکی تایبەتیدا، فەرمان بکات بەسەر ملیۆنێرێکدا کە بەدەستی رووت وەستابێ. پۆلیسێکی ترکی پانتۆڵ دڕاوی هەژار؛ دەتوانێ لە باکووری کوردستاندا، شەق لە ئاغایەکی کوردی خاوەن زەوی هەڵ بدات. کەواتە؛ هەر جیاوازیی لە دەسەڵاتی ئابووریدا، هەموو جۆرە دەسەڵاتێك نادات بە مرۆڤ و بە تەنێ نایەکسانی دروست ناکات. لێرەدا **"قوتابخانەی بیری ئازادی و یەکسانیی کوردی"** دەست بۆ جۆرە دەسەڵاتێکی دی رادەکێشێ، کە ئەویش **"دەسەڵاتی رۆشنبیری"**یە، و ئەم دەسەڵاتە دەبێتە هۆی دەست گرتن بەسەر دەزگەی بیرۆکراتی و تەکنیکی و بەڕێوەبەرێتی و لۆژستێکی کۆمەڵگەدا. هەر بە پێی ئەم بیرە، ئەوانەی رۆشنبیرن و سەرمایەی بیرکردنەوەیان هەیە، ئەوا لەڕێی ئەو دەسەڵاتەوە کە هەیانە؛ دەبنە **"چینێك"** بۆ خۆیان. ئەمەش لە هەموو جیهاندا، و بەتایبەتی لە نێو ئەو کۆمەڵگانەدا کە رۆشنبیر زۆر کەمن و خوێندەوار دەگمەنن. ئەگەر تەماشایەکی مێژووی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست و نێزیك لە چارەکە چەرخێکدا بکەین، دەبینین زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی دەسەڵاتی رۆشنبیریی خۆیان بەکار هێناوە، و بوونەتە یەکەم خاوەن دەسەڵاتی وڵاتەکانیان؛ وەك **جەمال عەبدولناسر، عەبدولکریم قاسم، موعەممەری قەززافی**، و **زیائولحەق** و کێ و کێ، ئەمانە هەموو لە خێزانی هەژارو رووتە بوون. بەڵام پاش ئەوەی چوونە بەر خوێندن و بوون بە ئەکادێمیکەرو شوێنێکیان لە دەزگەی بیرۆکراتی و بەڕێوەبەرێتیی دەوڵەتدا وەرگرت، ئەو دەمە توانیان لەو رێیەوە دەسەڵات بگرنە دەست، و **"چینێکی رۆشنبیر"** بهێننە کایە، و لە دەوری خۆیان کۆی بکەنەوە. شایانی باس ئەوەیە؛ کە **"رۆشنبیر"** هەر لە کۆنەوە لە نێو

کۆمەڵگەی کوردەواری‌دا؛ جی‌یەکی تایبەتی و بەڕێزی بووە و "**رۆشنبیریتی**" نێوونیشانی" **خانەدانێتی**" بۆ ئەو کەسە دروست کردووە. بۆ وێنە: خوێندەوار لە نێو کورددا پیٚ‌یان گوتووە "**میرزا**"؛ واتە لە نەوەی "**میر**"، کە "**میر**" لە زمانی کوردی‌دا؛ بە مانای "**فەرمانڕەوا**" و "**گەورە**" دیٚ، و لە بنەڕەتدا لە وشەی "**میترا**"وە وەرگیراوە کە بە مانای "**خۆر**" و "**خودیٚ**" دیٚ. ئاشکراشە کە مەلاکانی کوردستان، کە کۆن تاقە دەستەیەکی خوێندەوارو رۆشنبیری کورد بوون، زۆربەی هەرەزۆریان، ژیانێکی سۆفیلکەیەتی‌یان بردووەتە سەرو بە زەحمەت شێوی شەوی خۆیان پەیدا کردووە، و ژیانیان هەر لە قوتابخانەو زانستگەکانیاندا بە دەرزگوتنەوەو کتێب نووسینەوە بردووتە سەر، بەلاّم سوڵتانەکانی عوسمانی و شاکانی سەفەوی و قاجار لیٚ‌یان ترساون و کڕنووشیان بردووە بۆیان. بنچینەی ئەم دەسەلاّتەشیان ئەو رۆشنبیری‌یە بووە کە هەیان بووە، و لە رێیی ئەوەوە توانیویانە کار بکەنە سەر جەماوەری کۆمەڵگەکەیان و "**دەسەلاّت**" بۆ خۆیان پەیدا بکەن. "**رۆشنبیران**" بە پێی "**بیری ئازادی و یەکسانیی کوردی**" چینێکن بۆ خۆیان و بەرژەوەندی‌یەکی چینایەتی سەر بە چینەکەی خۆیان هەیەو هەموو کاتێك کوتەکی دەستی چینی بۆرژوای پیشەسان، یان بۆرژوای بازرگان نین.

یەکێك لەو کێشانەی کە "**قوتابخانەی بیری ئازادی و یەکسانیی کوردی**" هەڵوێستێکی رۆنی لە بارەیەوە پێشان داوە، مەسەلەی **هی خۆییی تاکی** (**الملكية الفردية**) و پێوەندیی بە "**کار**"ەوەیە. ئەم قوتابخانەیە بەر لە هەموو شتێك؛ باوەڕی بەوەیە کە تەنیٚ "**کار**" دەبێتە هۆی ئەوەی "**مافی خاوەنێتی**" بدات بەو کەسەی کە کارەکەی کردووە. بەلاّم ئەو "**ماف خاوەنێتی**" یە تەنیٚ لە "کارەکە"دا دەبیٚ، نەك لەو شتەدا کە کارەکەی تێدا کراوە. بۆ ئەمەش دەبێژیٚ:

"ئەگەر باوەڕمان هێنا بەوەی کە تەنیٚ "**کارکردن**"ە "**ماف**" دەدات بە مرۆڤ کە خۆی بە "**خێو**" (خاوەن) بزانیٚ، دیارە دەبیٚ دان بەوەشدا بنێین؛ کە هەر شتێك بەبیٚ کارکردنی مرۆڤ هاتبووە بەرهەم، ماڵی هیچ مرۆڤێك نی‌یە. جا لەبەر ئەوەی هەموو شتێك لە کەرەسەی خاو دروست دەکریٚ، و کەرەسەی خاو (**سەرەتایی**)یش هی هیچ کەسێك نی‌یە، و خۆی لە جیهاندا هەبووەو هەیە، و کەسیش ناتوانیٚ کەرەسەی خاو دروست بکات، چۆنکە ماددە دروست ناکریٚ؛ دیارە هەرچی‌یەك لەم کەرەسە خاوە دروست بکریٚ، هەر ئەو بەشەی دەبێتە

ماڵی مرۆڤ کە لەرێیی کارەوە هێنراوەتە بەرهەم، واتە "هەموو شتەکە" نابێتە ماڵی مرۆڤ. بۆ وێنە: ئەگەر هاتوو یەکێك دوکانێکی دروست کرد، بە بەردوخشت و گەچ و دار، و بەدەستی خۆی، ئەوا دیارە نە زەوی‌یەکە دەبێتە ماڵی ئەو، و نە ئەو کەرەسەیەی بەکاری هێناوە دەبێتە ماڵی وی، بەڵکو ئەو کارەی کە کردوویەتی دەبێتە ماڵی وی. جا لەبەر ئەوەی ئەو کەسە "**خاوەنی کارەکە**"یە و "**خاوەنی کەرەسەکە**" نی‌یە، دیارە تەنێ "**ماف**"ی ئەوەی هەیە، دوکانەکە بخاتە خزمەتی خۆیەوە، واتە دوکانەکەی "**بەدەستەوە بێ**"، نەك بیکاتە "**ماڵی خۆی**". کەواتە دەبێ، بەپێی ئەم بیرە ماف "**هی خۆیی**" (التملك) بگۆڕرێ بە ماف "**بەدەستەوەبوون**" (**الاستحواذ، التصرف**) و سووت لێ وەرگرتن. بە کورتی ئەو سامانانەی لە جیهاندان و بە زەحمەتی کەس دروست نەکراون، وەك زەوی و کەرەسەی خاو و ئاو و هەوا و دارستان، نابێتە ماڵی کەس، بەڵکو هەموو تاکێکی کۆمەڵگە ماف سووت لێ وەرگرتنی وەك یەکی هەیە لێیان. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەو شتانە بۆ قازانج دەسکەوتن، ناکڕرێن و نافرۆشرێن. لەمەشەوە ئاشکرا دەبێ کە ئاڵوگۆڕ کردن لە کۆمەڵگەدا، دەبێ هەر لەسەر بنچینەی ئاڵوگۆڕکردنی "**کار**" دابمەزرێ.

جا لەبەر ئەوەی ئەو سامانە و کەرەسە خاوانەی لە جیهاندان "**هی خۆیی**" هیچ کەسێکی تێدا نی‌یە. لەبەر ئەوە هیچ کەسێك "**لەتاکە تاکەی خەڵك و دەزگەی دەوڵەتی**" ماف ئەوەی نی‌یە، ئەو سامان و کەرەسانە خراپ بکات. بۆ وێنە زەوی و ئاو و هەوا و دارستان واڵێ بکات کە بە کەڵکی بەکارهێنان نەمێنن. بەمەدا دەردەکەوی کە "**قوتابخانەی بیری ئازادی و یەکسانیی کوردی**" چارەکە چەرخێك لەمەوبەر بە تەنگ **پاراستنی دەوروبەر** (بیئة)ەوە دەهات.

کێشەیەکی دی کە بەلای "**قوتابخانەی بیری ئازادی و یەکسانی**"یەوە زۆر گرنگە، کێشەی "**دەوڵەت**"ە. "**دەوڵەت**" بەپێی **بۆچوونی تیۆروانە بۆرژواکان**؛ دەزگەیەکی بێ لایەنەو "**لەسەروو کۆمەڵگە**"وە دەوەستێ، و نایەڵێ چین و دەستە جۆرجۆرەکانی نێو کۆمەڵگە بچن بەگژیەکدا. بە کورتی" **دەزگەیەکی یەك خستن و گونجاندن**"ە. بەڵام "**دەوڵەت**" بەلای مارکسیستەکانەوە؛ دەزگەیەکی سەرکوت کەرەو هەردەمە بەدەست چینێکەوەیە بۆ چەوساندنەوەی چینەکانی دی. هەر بە پێی مارکسیستەکان پرۆلیتاریا؛ پێویستە شۆرش بکات و دەزگەی دەوڵەتی لە دەست چینی سەرمایەدار دەربهێنێ و بیشکێنێ و لە جیاتی ئەوە

**"دیکتاتۆرێتیی پرۆلیتاریا"** بخاته کارو **"دەوڵەتی چینی پرۆلیتاریا"** دابمەزرێنێ.
هەرچی بیری ئازادی و یەکسانیشە، ئەوا وەك مارکسیستەکان و بە پێچەوانەی بۆرژواکانەوە، پێی وانیە کە **"دەوڵـەت"** دەزگەیەکی بێ لایەنە، بەڵکو بە دەزگەیەکی لایەنگری دەزانێ. چۆنکە **"دەوڵەت"** فریشتە نی‌یە و لە ئاسمانەوە کەوتبێتە خوارێ؛ بەڵکو بریتی‌یە لە دەسەلاتی بەشێك لە کۆمەڵگە. بەلام بە پێچەوانەی مارکسیستەکانەوە، کە **"دەوڵـەت"** بە دەزگەیەکی چینایەتی دادەنێن، ئەم هەموو کاتێك، دەوڵەت بە دەزگەی چینایەتی‌دانانێ، بەڵکو دەبێژێ: جاری وا هەیە دەوڵەت دەوڵەتی تاکە دیکتاتۆرێکە، جاری وا هەیە دەوڵەت دەوڵەتی بنەماڵەیەکە، جاری واش هەیە دەوڵەت دەوڵەتی دەستەیەك رۆشنبیرە، جاری واش هەیە دەوڵەت دەوڵەتی کەمایەتی‌یەکی ئاینی‌یە کە ژمارەیان لە کۆمەڵگەدا یەکجار کەمە، و هتد. بەلام **"دەوڵەت"** لە هەموو دۆخێك لەم دۆخانەدا؛ هەر لایەنگرەو بێ لایەن نی‌یە، و ئەمەش هەر بەم جۆرە دەمێنێ هەتا **"کۆمەڵگەیەکی یەکسان"** دروست دەبێ. کەی کۆمەڵگەی یەکسان، دروست بوو، ئەوسا دووری‌یە ژیاری‌یەکانی **"دەوڵـەت"**، لەگەڵ دووری‌یە ژیاری‌یەکانی **"کۆمەڵگە"** وەك یەکیان لێ دێ و **"دەوڵـەت"** ئەو دەمە هەرچەندە لە نێوناچی و نامرێ بەلام، **"کۆمەڵگە"** خۆی دەبێتە" **دەوڵەتی خۆی**". هەر بەپێی ئەم بیرە، نە شۆرشی بۆرژوازی و نە شۆرشی پرۆلیتاریا؛ هیچیان ناتوانن ئەو **"کۆمەڵگە یەکسان"**ە دروست بکەن؛ چۆنکە چ بۆرژواکان و چ مارکسیستەکان؛ نایەکسانیی کۆمەڵگە وەك خۆی دەهێڵنەوە. شۆرشی بۆرژوازی دەزگەی دەوڵەت دەداتە دەست چینی بۆرژوا، و شۆرشی پرۆلیتاریاش دەزگەی دەوڵەت دەداتە دەست چینی پرۆلیتاریا. بەلام پاش ئەوەی چینی پرۆلیتاریا هاتە سەرکار و **"دەسەلاتی"** گرتە دەست؛ ئیدی ئەوسا لە **"پرۆلیتاریایەتی"** دەکەوێ، دەبێتە**"فەرمانرەوا"** بەسەر تەواوی گەل‌دا. جا ئەو دەمە ئەوانەی کە نوێنەری ئەو چینەن؛ هیچ هۆیەك نی‌یە بۆ ئەوەی بچن **"دەسەلاتی خۆیان"** لەگەڵ ئەو بەشەی کۆمەڵگە؛ کە لەوان نین؛ بەش بکەن. لەبەر ئەوە بەپێیی قوتابخانەی **"بیری ئازادی و یەکسانیی کوردی"**، "دەوڵەتی هەموو گەل" هەر تەنێ لە کۆمەڵگەیەکی **"ئازادو یەکسان"**دا شێوای پێك هاتنە، چۆنکە هیچ **"بەشێك لەگەڵ"** (**چینێك**) ناتوانێ ببێتە نوێنەری **"هەموو گەل"**، مەگەر ئەوەی هەموو گەلەکە یەکسان بکات، ئەو دەمەش پێویست بە **"نوێنەرێتی"** نامێنێ.

له کۆتاییی ئەم چەند وشەیەدا کە لە جیاتی سەرەتایەك بۆ ئەم نامیلکەیە نووسراوە، هیوام وایە کە بەم کارەم خزمەتێکی گچکەی کولتووری سیاسی و فەلسەفیی کورد و رۆژهەلاتم کردبێ، و مەبەستیشم هەر ئەوە بوو، ئەو راپەڕینە رۆشنبیری‌یەی کە پتر لە چارەکە چەرخێك لەمەوبەر لە کوردستاندا سەری هەڵدا و رێبازێکی نوێی لە بیرکردنەوەی سیاسی و کۆمەلایەتیی کورددا هێنایە بوون؛ بێ پێچوپەنا و بێ گوێ دانە دڵی ئەم و ئەو، بخەمە بەرچاوی نەوەی ئەمڕۆ و بۆ رۆژگار تۆماری بکەم. هەر بەم بۆنەشەوە سوپاسێکی یەکجار گەرمی **"دەزگەی چاپەمەنیی ئازاد"** دەکەم بۆ ئەو ئەرك و زەحمەتە زۆرەی کە لە پێناوی چاپکردن و بلاوکردنەوەی بیری ئازاددا دەیکێشێ، بێگومان هیچ رەنجێك نی‌یە کە لە پێناوی ئازادی و یەکسانیی مرۆڤایەتی‌دا بدرێ و بە فیڕۆ بڕوات.

**جەمال نەبەز**

**بەرلین ١٩٨٤/١١/١١**

# ئازادی و دەسەڵات

ئازادی بەنرخترین و هێژاترین سەرمایەیەکی ژیانە کە دەسەڵاتی هێنەرە بوو (خالق) داوێتی بە مرۆڤ. ئەو مرۆڤانەی ئازاد نین؛ واتە پێبەندی مرۆڤی دیکەن؛ هەست بە تامو چێژی راستەقینەی ژیان ناکەن. خۆ ئەگەر گەیشتبنەتە پلەی هۆشیاریی سیاسی؛ ئەوا خۆیان زۆر بە نزم دێتە بەرچاو. بە کورتی "ئازادی" **خۆماڵێکی "خاصیة" بنچینەییی مرۆڤە**، و ئەو مرۆڤەی ئازاد نییە؛ مرۆڤی تەواو نییە.

**ئازادی وەك تەندروستی وایە**؛ نە بەدیاری دەدرێ بە کەس و نە دەکڕرێ و نەدەفرۆشرێ. لەبەر ئەوە یان دەبێ ئەو کەسە هەر لە رۆژی لەدایك بوونییەوە خۆی تەندروست بێ، و ئەوجا بە درێژاییی ژیانی؛ خۆی لە نەخۆشی و دەردو دوو بپارێزێ و خۆی تەندروست بهێڵێتەوە، یان ئەوەتە ئەگەر هاتو هەر لەزارۆیییەوە بە نەخۆشی و لەش بە باری لەدایك بوو بوو، ئەوا دەبێ لەڕێی وەرزین و جووڵانەوە و ئاگا لە خۆبوونەوە؛ خۆی تەندروست و بەهێز بکات. ئازادیش هەروەك تەندروستی وایە، سا یان ئەوەتە تۆ هەر لە زارۆیییەوە لە کۆمەڵگەیەکی ئازاددا لە دایك دەبیت و دەبێ ئازادیی خۆت تا مردن رابگریت، یان ئەوەتە لە کۆمەڵگەیەکی دیلدا لە دایك دەبیت و دەبێ هەلومەرج بۆ ئازاد بوونی خۆت برەخسێنیت.

**جا بۆ ئەوەی بتوانیت "ئازاد" بیت، دەبێ بەر لە هەر شتێك "دەسەڵات"ت هەبێ. ئەو مرۆڤەی "بێ دەسەڵاتە"؛ ئەوا "ئازادیش"نییە"، و ئەوی "ئازاد" نییە؛ "دەسەڵاتیشی" نییە؛ واتە "ئازادی" و "دەسەڵات"؛ دوو دیوی پارچە پارەیەکن بێیەکدی نابن.** جا بۆ ئەوەی ئەمە رۆن بکەینەوە؛ دەبێ جارێ چەند وێنەیەك پێشان بدەین و بپرسین بزانین:

بۆچی جۆتکارێك زەوی و زاری نییە و هەر دەبێ بچێ لە خاوەن زەوییەك زەوی ئیجارە بکات؟ چۆنکە جۆتکارەکە "**دەسەڵات**"ی نییە پارچە زەوییەك بکا بەماڵی خۆی. یان بۆچی کرێکارێك فابریقەیەکی نییە و دەبێ بە کرێی رۆژانە بۆ خاوەن فابریقەیەك کاربکا؟ چۆنکە کرێکارەکە "**دەسەڵات**"ی نییە بچێ فابریقەیەك بکڕێ و ببێتە خاوەنی. یان بۆچی کوردێك دەوڵەتی خۆی نییە؟. چۆنکە کورد "**دەسەڵات**"ی ئەوەی نییە داگیرکەران لە وڵاتەکەی دەربپەڕێنێ و ببێتە خاوەنی کوردستانەکەی خۆی. یان بۆچی ژنێك ناتوانێ بڵێ پیاو چ دەکا

و چۆن دەژی، منیش دەمەوێ وا بکەم و وابژیم؟ چۆنکە ژنەکە **"دەسەڵات"**ی نی‌یە لە رووی پیاودا وەربگەڕێتەوە، کۆمەڵگە کۆمەڵگەیەکی پیاو فەرمانی‌یە.

به کورتی: سەرچاوەی هەموو جۆرە **"ئازادی"** یەك **"دەسەڵات"**ە. جا تۆیش تا دەسەڵاتت زێتر بێ، ئەوا پلەی ئازادیت بەرزتر دەبێتەوە و بەرەکەشی فراوانتر دەبێت و تا دەسەڵاتیشت کەمتر بێ، ئەوا پلەی ئازادیت نزمتر دەبێتەوە و بەرەکەشی تەنگتر دەبێتەوە.

دەسەڵاتیش جۆر جۆرە: وەك دەسەڵاتی لەش، دەسەڵاتی پارە، دەسەڵاتی چەك، دەسەڵاتی چالاکی و رێکخستن، دەسەڵاتی بەڕێوەبردن و رۆشنبیری هتد، کە هەریەکەیان جۆرە ئازادی‌یەك پێك دێنن. جا کە تۆیش ویستت **"ئازادیی سیاسی"**ت دەستبکەوێ؛ کە دایکی هەموو ئازادی‌یەکانی دیکەیە؛ ئەوا دەبێ بەر لە هەموو شتێك **"دەسەڵاتی سیاسی"** پەیدا بکەیت.

**"ئازادیی سیاسی"**، وەك هەموو ئازادی‌یەکی دی؛ ناکڕدرێ و نافرۆشرێ و بە دیاری نادرێ بەکەس و، وەك گوێزەبانە بەسەر دەرو دراوسێدا نابەشرێتەوە، بەڵکو دەبێ پەیدای بکەیت، واتە دەبێ خۆت لێ هاتوو بیت بۆ وەدەست خستنی. کە دەستیشت کەوت؛ دەبێ ئەوەندەشت لە دەست بێ کە هەموو کاتێك بیپارێزیت لەوانەی دەیانەوێ لێت بیڕن. هەر لەبەر ئەمەیە ئەوانەی پێیان وایە کە لە هێزێکی دیکەوە، بۆ وێنە لە مرۆڤێکی دەست رۆیشتووی ئازادەوە، یان لە حیزبێکی بەهێزی ئازادەوە، یان لە دەوڵەتێکی بەهێزی ئازادەوە، دەتوانن **"ئازادی"**ی خۆیان وەربگرن، یان لەو باوەڕەدان کە هێزێکی ئازاد دەتوانێ ئازادیی بەبێ دەسەڵاتێك ببەخشێ، یان فشە ئازادی‌یەکی کەم دەسەڵاتێك بپارێزێ، بێگومان بە؛ ئەوانە بە هەڵەچوون. تۆ کە خۆت نەخۆش و لەش بە بار و لاواز بوویت؛ دەبێ خۆت خەریکی خۆت بیت و لە ڕێی وەرزین (ریاضة) و دەرمان کردن و خواردەمەنیی باش و خۆ بەهێز کردنەوە؛ خۆت تەندروست بکەیت. خۆ ئەگەر چوویتە لای دوکتۆرێك، ئەوا بزانە کە ئەو دوکتۆرە تەنێ دەتوانێ رێیەك پێشان بدا و چەند پێشنیازێك بکات، بەڵام ئەو کەسەی کە ئەو رێیە دەگرێ و پێشنیازەکانی دوکتۆرەکە دەخاتە کار، ئەو کەسە تەنێ خۆتیت، و هەر خۆتیت کە دەبێ هەوڵ بدەیت کە **"گۆڕان"**ێك لە لەشی خۆتدا رووبدات، ئەگەنا هەزاران دوکتۆر ناتوانن تەندروستی و لەش ساغی ببەخشن پێت.

ده "ئـازادی"یش هەروایە و لـە خۆتـەوە دەسـت پـیّ دەكـات. كـە ویسـتت **"ئازادیی سیاسی"**ت دەست بكەویّ؛ دەبیّ خۆت هەوڵ بدەیت **"دەسەڵاتی سیاسی"** بخەیتـە دەسـت خـۆت و، هـەر خۆشـت ئـەوەت لـەبار دابـیّ كـە بتوانیـت ئـەو **"ئازادی"**یە بپاریزیت و ئەوەش لە ڕێی پاراستنی **"دەسەڵات"**ەكەتەوە. هەر لەبەر ئەوەشـە كـە یـەكێك لـە دەسـتووره بنچینەیی‌یـەكانی "قوتابخانـەی كوردیـی سۆسیالیزم" دەستووری "پشت بەخۆبەستنە"؛ بە "خۆ وبەس" وەك هۆنـەر دەڵیّ:

**هیوام بەخۆمە ؛ كەی بەتامای تۆم**

**كێیە بۆم بگری، لە پاش خۆم، وەك خۆم**

ئەمجا بۆ ئەوەی **"دەسـەڵاتی سیاسـی"** پـەیدا بكـەیت؛ دەبیّ لـە ژیـاندا ریّ و شوێنێكی سیاسی‌یانە بگریت و پرۆگرام و پێڕۆیەكی سیاسیت ببیّ و لەسەری بڕۆیت بـەرێوە. ئەوانـەی بـیّ پرۆگـرام و بـیّ ریّ و شـوێنن؛ سـەر لیّ شـێواو و چەواشە و سەركوێر و شەپڕێون. مرۆڤی سەر لیّ شێواو و چەواشەو سەركوێر و شەپڕێو؛ ناتوانن بیری خۆیان لە دەوری شتێك كۆبكەنەوە؛ لەبەر ئەوەشـە كـە ناتوانن تێكۆشانی خۆیان ئاڕاستەی ئامانجێكی دیاری كراو بكەن، و بە زۆری تووشـی ڕێڕێیـی و دوو دڵـی و سـەرمەوقولات دان دەبـن و لـە ئـەنجامدا دەسەڵاتیان دەست ناكەویّ.

بە كورتی بە پێی ئەم بیرە: یەكەمین هەنگاوت بەرەو پەیداكردنی "دەسەڵاتی سیاسی" ئەوەیە كە خەریكی سیاسەت بیت و خـۆت لـە سیاسـەت نەدزیتـەوە. كەواتە نابیّ بڵێیت **"دەخلم چی‌یە بەسەر سیاسەتەوە"** یان **"دەست دەگرم بـە كـڵاوی خۆمـدا بـا نـەییا"** چۆنكە جاریّ تۆ ناتوانیت بڵێیت **"دەخلـم چی‌یـە بەسـەر سیاسـەتەوە"**. هـەروەها هیـچ كەسـێكی دی ئـەم جیهانـە نـاتوانیّ خـۆی لـە **"سیاسەت"** جیا بكاتەوە. **"سیاسەت"** مانای "ژیـان"ە و هـەموو لایـەنێكی ژیانی گرتووەتەوە. جا ئایە دەتوانیت بڵێیت: **"خۆم لـە ژیـان دووره و پـەرێز دەگـرم"**؟. نـەخێر ناتوانیت. چۆنكە ئەگـەر وات گوت؛ دەبـیّ مـاڵاوایی لـە ژیـان بكـەیت و خۆت بكوژیت و ئەوەش كاتێك دەبیّ كە تێكچووبیت و مێشكت لـەكار كـەوتبیّ و لە ژیان بیّ هیـوا بووبیت. خـۆ ئەگـەر مـاڵاواییت لـە ژیـان نـەكردو وویسـتت بژیت؛ ئەوا بزانە كە **"سیاسەت"** بەرۆكت بەرنادا و ئەوەش بزانە كە تۆ ناتوانیت هەموو كاتێك دەست بە كڵاوەكەی خۆتەوە بگریت لە ترسی با و باكەش واز لـە **"كڵاو"**ە كەت ناهێنیّ. جا لەبەر ئـەوە تـۆ هـەزار جار بڵێیـت سیاسـەت ناكـەم و

دەخلم بەسەر سیاسەتەوە نی‌یە و بتەویٚ لە **سیاسەت** دوور بکەوبتەوە، ئەوە بزانە کە "**سیاسەت**" وازت لیٚ ناهیٚنیٚ. چۆنکە تۆ بە هەر باریٚکدا لیٚکی بدەیتەوە؛ **هەر تاکیٚکیت لە کۆمەڵگە**. جا کە کۆمەڵگە نەیتوانی لە "**سیاسەت**" دوور بکەویٚتەوە؛ کە ناشتوانیٚ، ئایە تۆیەك کە ئەندامیٚکی ئەو کۆمەڵگەیەیت، دەتوانیت خۆت لە "**سیاسەت**" بدزیتەوە؟ بیٚگومان نەء. بۆ ویٚنە: تۆ کە ویستت لە ماڵەوە بچیت بۆ بازیٚڕ؛ دەبیٚ هەموو لەشت بکەویٚتە ریٚ بەرەو بازیٚڕ. خۆ ناتوانیت بڵیٚیت هەر قاچم یان دەستم دەنیٚرم بۆ بازیٚڕ و با سەر سەلامەت بیٚ. مەگەر ئەوەی قاچت یان دەستت لە لەشت بکەیتەوە.

جا کە کۆمەڵگە کەوتە بزووتن و، ئەوەش بزانە کە کۆمەڵگە لە هەموو چرکەیەکی ژیاندا لە بزووتندایە و وەستان نی‌یە بۆی، ئەوسا تۆیش ناتوانیت بڵیٚیت خۆم لە کۆمەڵگەدا دەبڕم، کە وات گوت؛ دەبیٚ ببیتە ئەو نینۆکەی لەبەر پیسی دەیکەن و فڕیٚی دەدەن، یان ببیتە ئەو دانە کرمۆڵەی لە ترسی نەخۆشی دەری دەکیٚشن و توورِی هەڵ دەدەن.

جا کە تۆش گوتت: "**بابە سیاسەت ناکەم و خۆم لە کۆمەڵگە جیادەکەمەوە**"، ئەمە مانای وایە کە تۆ خۆت، واز لە "**ئازادیی خۆت**" دەهیٚنیت و ریشی خۆت دەدەیتە دەستی ئەم و ئەو یاری پیٚ بکەن و ئەو دەمەش ناچار دەبیت لەبەر بیٚ دەسەڵاتی خۆت؛ ببیتە کەر و پشت بۆ هەموو "**بەدەسەڵاتیٚك**" دابنەویٚنیت کۆپانی بخاتە سەر. جا ئایە تۆ بەم جۆرە ژیانە رازی دەبیت؟

بیٚجگە لەوەش؛ کە تۆ بیٚیت و ئازادیی خۆت بەکار نەهیٚنیت؛ واتە لەدژی ئازادیی خۆت کار بکەیت، لەمەدا دەردەکەویٚ کە تۆ دژی ئازادیت، با ئازادی‌یەکەش پیٚوەندیی بە خۆتەوە بیٚت و پیٚوەندیی بە یەکیٚکی دی‌یەوە نەبیٚ، ئەوە هەریەکە. چۆنکە ئەو کەسەی کە دەچیٚ خۆی دەکوژیٚ، خۆ ئەو کەسە دەست دریٚژ ناکا بۆ ئازادیی هیچ کەسیٚك لە ئازادیی خۆی زیٚتر، بەلاٚم لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کەسە، وەك هەموو بکوژیٚکی دی، هەر بکوژو تاوانبارە؛ با هەر خۆشی بکوژیٚ و یەکیٚکی دی نەکوژیٚ. چۆنکە ئەو کارەی ئەو دەیکا؛ دەست دریٚژی‌یە بۆ سەر "**ئازادیی بوونی ژیان**"یٚك. "**ژیان**" چرایەکی کردگارە و هیچ کەسیٚك بە دیاری بەکەسی نەداوە، تا ماف ئەوەی بیٚ لیٚی بسیٚنیٚتەوە.

تۆیش کە "**چرای ژیان**"ت بە خۆت نەبەخشیوە، ماف ئەوەت نی‌یە بیکوژیٚنیتەوە. راستی‌یەکەشی ئەوەیە کە هەموو خۆکوژیٚك لە ئەنجامی ون کردنی هۆش و تیٚکچوونی میٚشك و هیٚزی بیرکردنەوەدا؛ وای لیٚ دیٚ کە لەو کاتەدا "**دەسەلاٚت**"ی

بەسەر خۆیدا نەمێنێ. جا وەك لەمەوبەر گوتمان؛ "**بێ دەسەلاتی**" مانای نەبوونی "**ئازادی**"یە، هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەو "**خۆکوژ**"ە "**دەسەلات**"ی ئەوەی نامێنێ "**ئازادی**"ی "**ژیان**"ی خۆی رابگرێ و ئەوجا دەستی دەچێتە خۆی و "**خۆی دەکوژێ**". جا وەك چۆن ئێمە کە باوەڕمان بە "**ئازادی**" هەیەو رێت نادەینێ "**خۆت**" بکوژیت، دیارە لێشت ناگەڕێین لە "**دژی ئازادیی خۆت**" کار بکەیت. "**ئازادی**" مافی خۆتە و دەبێ واز نەهێنیت لێی. لەبەر ئەوە دەبێ خەریکی "**سیاسەت**" بیت.

ئێستە دوور نییە بیانوویەك بهێنیتەوە و بڵێیت: "لەبەر ئەوەی چەند کۆمەڵێکی سیاسەت کەر هەن و هەموویان لە دژی یەکن و منیش نامەوێ شەڕی دژایەتیی نێوانیان خۆش بکەم بەوەی بچمە سەر لایەکیان، لەبەر ئەوە بێ لایەنیم بە خۆم رەوا دیوە". دوور نییە ئەم بیانووە لەسەرەتاوە بە قسەیەکی بەجێ بێتە بەردڵی هێندێ لەوانەی ساویلکانە لەشت دەکۆڵنەوە. بەڵام ئەگەر مرۆڤ تۆزێك بە هوردی سەرنجی ئەم قسەیە بدات؛ دەبینێ لە بنەڕەتدا لە "**هەڵپەرستی**"یەك کە ئەنجامەکەی بە "**دوژمنایەتیی ئازادی**" تەواو دەبێ؛ هیچی دی نییە. چۆنکە ئەگەر وادابنێین کە چوار کۆمەڵی سیاسی لەو وڵاتەی تۆدا هەن، سا یان ئەوەتە ئەو چوارە؛ هەموویان بۆ ئازادیی کۆمەڵگە هەوڵ دەدەن؛ یان هێندێکیان هەوڵ دەدەن بۆ ئازادیی کۆمەڵگە و هێندێکیشیان هەر بۆ ئازادیی خۆیان هەوڵ دەدەن، یان هەر یەکەیان بۆ ئازادیی خۆی هەوڵ دەدا. لەمە پتر "**ئیحتیمالێك**"ی دی نییە. جا با دەمەتەقێیەك لەگەڵ ئەم "ئیحتیمالانە"دا بکەین.

ئەگەر لەو وڵاتەدا کە تۆ تێیدا دەژیت، چەند کۆمەڵێکی سیاسی هەبوون و هێندێکیان بۆ ئازادیی کۆمەڵگە هەوڵیاندا و، هێندێکشان بۆ ئازادیی خۆیان، ئەوا تۆ دەبێ بچیت لەگەڵ ئەوانەدا کاربکەیت کە بۆ ئازادیی کۆمەڵگە هەوڵ دەدەن. خۆ ئەگەر زانیت هەموو ئەو کۆمەلانە هەریەکەیان تەنێ بۆ ئازادیی خۆی هەوڵ دەدا؛ ئەوا دەبێ بزانیت کە ئەمانە هەموو "**دژی ئازادیی کۆمەڵگە**"ن.

لەم بارەدا پێویستیی سەرشانی تۆ ئەوەیە بچیت هەموو ئەم کۆمەلانە لە نێو کۆمەڵگەدا بە پەند بکەیت، بەوەی تۆ "**خۆت**" خەریکی "**سیاسەت**" بیت. خەریك بوونی سیاسەت پێویستیی بەوە نییە کە تۆ هەر دەبێ لە حیزبێکدا کار بکەیت، دەتوانیت بەتاقی تەنیاش بیکەیت. ئەو کارە تەنیاییەی تۆ بەرەبەرە لە نێو کۆمەڵگەدا کاری خۆی دەکا و چەندایەتی پەیدا دەکا.

خۆ ئەگەر خۆت لە سیاسەت دزی‌یەوە؛ مانای وایە؛ ڕێ بۆ ئەوانە چۆڵ دەکەیت کە دژی "**ئازادیی کۆمەڵگە**"ن. ئەمجا ئەگەر هاتوو یەکێك لەو کۆمەڵە سیاسی‌یانە بۆ "**ئازادیی کۆمەڵگە**"هەوڵی‌دا؛ ئەوا تۆ دەبێ مەردانە لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا کار بکەیت کە بۆ "**ئازادیی کۆمەڵگە**" تێ دەکۆشێ، با بە ژمارەش کەمترینی کۆمەڵەکان بێ، ڕاستی و هەق بە ژمارە نی‌یە. چۆنکە تۆ ئەگەر یارمەتیی ئەو کۆمەڵە نەدەیت کە بۆ "**ئازادیی کۆمەڵگە**" خەبات دەکا لە دژی ڕژێمێکی فەرمانڕەوای دیکتاتۆر، یان چەند کۆمەڵێکی سیاسی کە هەریەکەیان تەنێ بۆ ئازادیی خۆی و دژی ئازادیی کۆمەڵگە هەوڵ دەدا، ئەوا دیارە ئەم "**بێ دەنگی**"یەی تۆ خزمەتێکی ناڕاستەوخۆی گەورەیە بە دوژمنانی ئازادیی کۆمەڵگە. چۆنکە بەشدار نەبوونی تۆ لە کاری سیاسی‌دا لە "**هێز**"ی ئازادی خوازانی نێو کۆمەڵگە کەم دەکاتەوە؛ بەڵام لە "**هێز**"ی بەربەرەکانیی ئەوانەی لە دژی ئازادیی کۆمەڵگەن هیچ کەم ناکاتەوە و وەك خۆی دەیهێڵێتەوە. ئەمەش مانای وایە کە تۆ لەم دۆخەدا دژی ئازادیی کۆمەڵگە کار دەکەیت و لەو ڕێ‌یەشەوە لە دژی ئازادیی خۆشت دەوەستیت کە تاکێکیت لە "**کۆمەڵگە**".

کەواتە تۆ ئەگەر ئازادیخوازیت و دەتەوێ کۆمەڵگە ئازاد بێت؛ دەبێ یەکەم خۆت لە سیاسەت دوور نەخەیتەوە؛ چۆنکە دوورکەوتنەوەت لە سیاسەت مانای خراپەکاری‌یە لە دژی ئازادیی کۆمەڵگە و ئازادیی خۆت، و دووەمیش دەبێ، ئەگەر بەرەیەکی سیاسی هەبوو بۆ ئازادیی کۆمەڵگە کاری کرد، لەگەڵ ئەو بەرەیدا کاربکەیت. ڕاستە تۆ دەتوانیت بە تەنیا سیاسەت بکەیت و هەوڵ بدەیت و بۆ ئازادیی کۆمەڵگە تێ بکۆشیت؛ بەڵام ئەوە بزانە کە تۆ ناتوانیت بە تەنیا باڵ کۆمەڵگە ئازاد بکەیت. چۆنکە ئازادکردنی کۆمەڵگەیەك وەك ئەوە نی‌یە تۆ بچیت بڵێیت بەتەنێ کاردەکەم بۆ خۆم و دەبمە پارەدارو دەوڵەمەند. بەڵێ لەوانەیە بەتەنیا باڵ بکەویتە کار و هەوڵ دان و ببیتە سەرمایەدارێکی زۆر گەورە. بەڵام بەتەنیا باڵ ناتوانیت ئازادیی بۆ کۆمەڵگەیەك بسێنیت. لەبەر ئەوە دەبێ کۆمەڵگە بجوولێنیت و بەهەژێنیت کە بتوانێ خۆی خۆی ئازاد بکات لەڕێی یەکگرتنی ئەو تاکانەیەوە کە بۆ ئازادیی کۆمەڵگە هەوڵ دەدەن. جا لەبەر ئەوەیە کە دەبێ تۆ لەگەڵ ئەو جۆرە تاکانەدا کاری خۆت یەك بخەیت؛ واتە لەگەڵ کۆمەڵێکی سیاسی‌دا کاربکەیت کە بۆ ئازادیی کۆمەڵگە هەوڵ دەدات، نەك بۆ ئازادیی کۆمەڵەکەی خۆی، یان حیزبەکەی خۆی بەتەنیا. چۆنکە ئەو حیزبەی کە تەنیا بۆ ئازادیی خۆی هەوڵ دەدا، هەر دەیەوێ "**خۆی**" بگەیەنێتە

ئازادی، نەك "**کۆمەڵگە**" بگەیەنێتە ئازادی. جا وەك چۆن مرۆڤ ئەگەر تەنێ بۆ ئازادیی خۆی هەوڵی‌دا، ئەوا هەر بۆ دەسەڵات پەیداکردنی خۆی هەوڵ دەدا، هەر ئاواش ئەو حیزب و کۆمەڵە سیاسی‌یانەی تەنێ بۆ ئازادیی خۆیان، هەوڵ دەدەن، دەیانەوێ جارێ دەسەڵات بخەنە دەست خۆیان، ئەوجا "**دەسەڵات**" لە حیزبەکان و کەرتەکانی دیکەی کۆمەڵگە ببڕن و لە ئەنجامی ئەوەدا "**بێ ئازادی**" بیان هێڵنەوە. لێرەدا دەبێ بەر لە هەموو شتێك بزانیت کە هێچ هێزێکی دڕندەی فاشیستانە و خوێنڕێژانە و دیکتاتۆرانە لە جیهاندا نەبووەو نی‌یە و نابێ کە دژی "**ئازادی**" بێ؛ وەك "**بنچینە**"یەك. خوێنڕێژترین و ملهوڕترین سیاسەتگەرانی مێژوو، و دڕندەترین و دیکتاتۆرترین کۆمەڵە و حیزبی ئەم جیهانە، چ لەرابووردوو و چ لە ئێستەدا، هەموویان باسی "**ئازادی**"یان کردووە و دەیکەن و هەوڵیان بۆ "**ئازادی**" داوە و دەیدەن. بەڵام ئەو پرسیارەی کە دەبێ بکرێ ئەوەیە: ئایا ئەمانە "**ئازادی**"یان بۆ کێ ویستووە و لەبەر چی ویستوویانە "**ئازاد**" بن؟ ئێمە دەزانین کە **دەوڵەتی عوسمانی** کاتێ ساڵ دەری دوانزەی مانگی لە شەڕدا بوو لە دژی ئەوانەی کە گوایە "**کافر**" بوون و هەوڵی دەدا وڵاتی دیانەکان داگیر و کاول بکات و دەسەڵاتی گەلەکانی نەهێڵێ تاکو "**ئازادی**" یان نەمێنێ، ئەمە بۆ ئەوەبوو کە "**ئازادیی خۆی**" و "**ئازادی**" تەنێ هەر "**بۆ خۆی**" بپارێزێ. سوڵتانەکانی عوسمانی دەیانگوت "**ئێمە خوا فەرمانی داوە پێمان کە دوژمنانی خوا ملکەچ بکەین**". بە ملکەچکردنی "**دوژمنەکانی خوا**"؛ دەچون "**ئازادی**"ی "**ژێردەست کردن و کە نەفت کردن**"ی بەشێکیان لە مرۆڤایەتی بۆ خۆیان دەپچڕی. ئەگەر نا ئەم سوڵتانە ترکانە دوژمنی "**ئازادیی خۆیان**" نەبوون. بەڵکو "**ئازادیی خۆیان**" لە "**دیلێتیی خەڵك**"دا دەدی. ئەو ترکە لاوانەی کە بە "**ژۆن ترك**" نێویان رۆیوە، بزووتنەوەکەیان لە ژێر ئالای "**ئازادی**" و "**دادخوازی**" و "**وەك یەکی**"دا دەست پێ کرد. کە هاتنە سەر کار؛ دەرکەوت کە مەبەستیان لە "**ئازادی**" تەنێ "**ئازادیی خۆیان**" بوو؛ چۆنکە هەر زوو رێی ئازادی‌یان لە خەڵکی دی گرت.

هیتلەرو نازی‌یەکانی هاوڕێی کە چەند ملوێنێك جوولەکەو رووس و فەرەنسەیی و ئەڵمان و ئەورووپاییی دیکەیان لە نێوبرد؛ بە ئاشکرا دەیانگوت "**ئێمە بۆ ئازادیی رەگەزی ئاریایی هەوڵ دەدەین کە پێشکەوتووترین رەگەزی جیهانە و لە بەر ئەوە دەبێ رەگەزە نزمەکان بەژێر دەستەیی بژین**". ئەوان نەیان دەگوت "**ئێمە دژی ئازادین**" و راستی‌یەکەشی دژی ئازادیی خۆیان نەبوون، دژی ئەوە

بوون کە خەڵکی دی، واتە ئەوانەی لەوان نەبوون "**ئـازاد**" بن. سەددام و بەعسی‌یەکانی هاوڕێی هیچ کاتێك نەیانگوتووە و ناڵێن "**ئێمـە دژی ئـازادین**" و ئەوەتە یەکێك لە ستراتیژە سێ کوچکەکەیان "**ئـازادی**" یە (**وحدة-حرية-اشتراكية**). ئەوان کە "**دەسەڵات**" لە هەموو حیزب و دەستەیەك کە لە خۆیان نەبێ دەستێننەوە و "**دەسەڵات**" دەخەنە دەست خۆیان؛ تەنێ لەبەر ئەوەیە کە ئەوان "**ئازادی**"یان هەر بۆ "**خۆیان**" دەوێ. جا وەك کورد گوتوویەتی: "**سەگ لە کولێرە راناکات**"، دڕندەترین چوار پێ کە گۆشت ببینێ راناکا لێی و فڕێی نادا، بەڵکو پەلاماری دەداو بۆ "**خۆی**" داگیری دەکا. "**ئازادی**"ش وایە؛ دڕندەترین کۆمەڵە و حیزب و تاکی سیاسی ئەم جیهانە رانکالێی و دژی ناوەستی؛ بەڵکو بۆ "**خۆیی دەوێ و دەیکا بەماڵی خۆی**".

ئەمجا بۆ ئەوەی مرۆڤێکی ژیر لە دڕندەیەکی کێوی جیا بکەینەوە؛ دەبێ ئەوە بهێنینە بەرچاومان کە "**مرۆڤی ژیر نابێ ئازادی هەر بۆ خۆی بوێ**". واتە ئەو نانەی کە دێتە سەر "**خوان**"؛ نابێ یەکێك بێ و وەك دڕندە قەپ بکا بە هەموویدا و لرفی‌بدا؛ بەڵکو دەبێ هەموو خێزانەکە لێی بخواو بۆ تاکە "**یەکێك**" یان چەند کەسێکی ئەو خێزانە نەبێ. کەواتە "**ئـازادی**" کـە "**ملکێکـی گشـتی**"ی هەموو "**مرۆڤایەتی**"یە؛ نابێ تەنێ بۆ یەك کەس و یەك کۆمەڵ و یەك حیزب و یەك دەوڵەت و یەك رەگەز و یەك ئاین و یەك نەتەوە بێ، بەڵکو دەبێ بۆ سەرجەمی تەواوی "**کۆمەڵگەی ئادەمزاد**" بێ "**بێ جیاوازی**".

کوێرەوەریی کۆمەڵگەی ئادەمزاد تا ئێستە لەوەدا بووە و لەوەدایە کە هەر بەشێك لەوانەی ئازادی‌یان بۆ خۆیان ویستووە، یان ئازادی‌یان بۆ خۆیان دەوێ، هاتوون بە نێوی شتێکەوە یان بە بیانووی شتێکەوە مافیان داوەتە دەست خۆیان کە هەر خۆیان ئازاد بن و رێی ئازادی‌یان لەوانی دیکە گرتووە و دەیگرن. جا بۆ ئەوەی ئەم "**ئازادی**"یە بۆ "**خۆیـان**" مسۆگەر بکەن و "**ئـازادی**" لەوانەی دی بگرن، دەچن رێ و شوێنێکی سیاسی دەگرن و لە ژێر ئاڵایەکی بە رواڵەت "**ژیربێژانە**"دا دەچن بەڕێوەو؛ وای پێشان دەدەن کە "**هەق**" هەر بەلای "**خۆیان**"ەوەیە و بەلای کەسی دیکەوە نی‌یە. جا لەبەر ئەوەی "**هەق**" هەر بەلای ئەوانەوەیە؛ دەبێ ئەوانەی لەسەر "**ناهەق**"ن نەمێنن و لە نێو بچن. جا هەر لەم بیرە تەسکوتروسك و دوژمن بە "**ئازادیی کۆمەڵگە**"یەوە؛ بیری "**حیزبی پێشـڕەو**" و "**سەرکردەی تاقانەی گەل**" و "**رێبەری بێ هاوتا**" و "**وەکیلی خـوا**" و ئەم جۆرە بڕوبیانووانە دێنە کایەوە و کاریش دەکەنە سەر نەزان و بیرنەکەرەوە و تێ

نەگەیشتوو و، لە هەمان کاتدا ئەوانەی خۆبژێن و هەلپەرست و کوڕی ڕۆژ و خوێڕی و چڵکاو خۆرن؛ لە دەوری کۆدەبنەوە و گڕی ئاگرەکەی خۆش دەکەن و لە ئەنجامدا هەر بە نێوی "ئازادی"یەوە "ئازادی" سەردەبڕدرێ.

جیاوازیی "**هاوبیرانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم**" لە کۆمەڵانی دی لەوەدا نییە کە هاوبیرانی ئەم قوتابخانەیە خۆیان بەڕاست نازانن و بیروباوەڕی خۆیان بە هەق نازانن، یان بیروباوەڕی دی بەراستتر و هەقتر لە هی خۆیان دەزانن و لەبەر ئەوەیە "ئازادی" بە خەڵکی دیکەش ڕەوا دەبینن. نەخێر وانییە. هاوبیرانی ئەم قوتابخانەیە خۆیان بەڕاست و بیروباوەڕەکەیان بە هەق دەزانن. دیارە لە چاو بیروباوەڕو ڕێی خۆیاندا، هەموو بیروباوەڕەکانی دی بە ناهەق و ڕێیەکانی دی بە ناڕاست یان لاڕێ دەزانن، بەڵام ئەوەی هاوبیران لە گەلێك خەڵکی دی جیادەکاتەوە ئەوەیە، هاوبیران "ئازادی" بە مافێکی بنچینەیی و سروشتیی مرۆڤ دادەنێن کە هیچ مرۆڤێکی دی مافی دەست بۆ بردنی نییە. هەر لەبەر ئەوەش هاوبیران خۆیان بە "**سەرکردەی تاقانەی گەل**" و "**گەورەی کۆمەڵگە**" و "**تاکە دەمڕاست**" و "**وەکیلی خوا**" نازانن؛ و بێ پێچو پەنا دەبێژن: ئێمە بیروباوەڕەکەمان بە "**بیروباوەڕێکی پێشڕەوانە**" دەزانین؛ نەك تاکە تاکەی خۆمان. ئێمە "**خۆمان**"مان وەك هەموو مرۆڤێکی دی ئەم جیهانە دێتە بەرچاو کە هیچ کاتێ لە ناتەواوی و خەوش (**عیب**) و هەڵە و کەموکورتی بە دوور نییە و نابێ. ئێمە نە "**گەورەی کەسین**" و نە لە "**گەورەیەتی**" و "**زلێتی**" دەگەڕێین. ئێمە "**کوتەك بەدەست**" نین؛ بەڵکو "**چرا بەدەست**" و "**ڕێ پێشاندەر**"ین. ئەوی "**چرا بەدەست**" و "**ڕێ پێشاندەر**"ە؛ ناچارە لە پێش کۆمەڵەوە بڕوا و چراکە ڕاگرێ بۆیان، چۆنکە ئەگەر لە پشتیانەوە بڕوا؛ ئەو دەمە بەردەمیان ڕۆناك نابێتەوە. "**چرا بەدەست**" هەر چەندە لە پێش کۆمەڵەوە دەڕوا؛ بەڵام هیچ کاتێك سواری قەڵاندۆشکانی ئەوانە نابێ کەڕێ ڕۆناك دەکاتەوە بۆیان و هیچ کاتێك بە قامچی تێیان بەرنابێ و، وەك شوانی مێگەلە مەڕ لێیان ناخوڕێ. ئێمەش چرایەکمان گرتووە بەدەستمانەوە، هەر کەسێ دێتە بەری بەخێر بێ و ئەوی نایەتە بەری، با چرایەکی دی بۆ خۆی بدۆزێتەوە؛ بەڵام دەبێ چرایەك بۆ خۆی بدۆزێتەوە، هەر چرایەك دەبێ پیرۆزی بێ. بەڵام نابێ لە تاریکیدا بمێنێتەوە. ئەوی لە تاریکیدا بمێنێتەوە؛ ئێمە لێی بە گومان دەبین. ڕێ بە هیچ کەسێك نادەین بەنێوی "**بێ لایەنیی درۆزنە**"وە لە تاریکیدا بوەستێ و بەرد بگرێتە چراکەمان.

ئێمە پێمان وایە و لە نێو جەرگەی بیرکردنەوەیەکی ژێر بێژانە (منطقي)ی قووڵەوە پێمان وایە کە چراکەمان لە چرای هەموو لایەك بەهێزترە. جا لەبەر ئەوەی لە تیشکی بەهێزی چرای خۆمان دڵنیاین، دەزانین ڕۆژێ لە ڕۆژان، زوو یان درەنگ، خەڵکی واز لە چرای دیکە دێنن و خۆیان بۆ ئەم چرایەی ئێمە دەکوتن. لەبەر ئەوەیە ئێمە چرای کەس ناشکێنین و بەخیلی بەکەسیش نابەین.

هەر لەبەر ئەوەشە ئێمە دژی **"ئازادی"**ی هیچ کەس و هیچ کۆمەڵ و هیچ لایەك نین و دەمانەوێ هەموو **"لا"**یەك **"ئازاد"** بن؛ واتە **"دەسەڵات"** بە هەموو **"لا"**یەك ڕەوا دەبینین، لە یەك باردا نەبێ؛ ئەوەش ئەوەیە ئەو **"کەسە"** یان ئەو **"کۆمەڵە"** یان ئەو **"دەوڵەتە"** یان ئەو **"دەزگە"**یە؛ هەوڵ تەنیا بۆ **"ئازادیی خۆی"** بدا؛ واتە **"دەسەڵات"**ی خۆی بەکاربهێنێ بۆ ڕێگرتن و بڕینی **"دەسەڵات"**؛ واتە **"ئازادی"**ی لەلایەنەکانی دی. لەو کاتەشدا ئێمە ئەگەر پێمان کرا هەر تەنێ **"دەسەڵات"** لەو **"هێز"**ە یان ئەو **"لایەن"**ە دەسێنینەوە؛ بەڵام خۆی، **"وەك خۆی"** لە نێو نابەین. ئێمە لە بنەڕەتەوە نامانەوێ **"مار"** بکوژین، بەڵکو دەمانەوێ **دانی** دەربکێشین و وای لێ بکەین بە خەڵکەوە نەدا.

کەواتە ئێمە بۆ **"ئازادیی کۆمەڵگە"** تێ دەکۆشین، بۆ **"ئازادیی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی"** و، لە سەرەتاوە لە جێی خۆمانەوە واتە لە **"کۆمەڵگەی خۆمان"**ەوە دەست پێ دەکەین. تۆیەکیش کە دەتەوێ **"ئازاد"** بیت **"وەك تاکێکی کۆمەڵگە"**؛ پێویستە شان بەشانی ئێمە بۆ **"ئازادیی کۆمەڵگە"** تێ بکۆشیت، واتە پاش ئەوەی قسەکانمانت بیست و کردەوەکانمانت دی و هەردووکیانت بەدڵ بوو، ئەوجا پێویستە بێیتە ریزەکانی ئێمەوە. چۆنکە تا ریزەکانمان بەهێزتر و پڕو چڕتر بێ، ئەوا هێزەکەمان زووتر دەتوانێ ئازادی بۆ کۆمەڵگە وەدەست بهێنێ و هەر چیش بژی دەبینێ.

بەم پێیە یەکێك لە بنچینەکانی **"قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم"** **"ئازادی"**یە و ئەو ڕژێمانەی دژی **"ئازادی"**ن، با خۆشیان بە **"ڕژێمی سۆسیالیستی"** بدەنە قەڵەم؛ بەڵام لەلایەن هاوبیرانی ئەم قوتابخانەیەوە بە **"ڕژێمی دژی سۆسیالیزم"** دێنە ناسین. لەبەر ئەوە هەموو ڕژێمێکی دیکتاتۆرانە و فاشستانە و ئۆتۆریتێرانەو ئێتاتیستانە و تۆتالیتێرانە بەپێی بیری ئەم قوتابخانە کوردی‌یە- ڕژێمی سۆسیالیستانە نین، چۆنکە دژی ئازادین.

# یەکسانکردنی کۆمەڵگە،
# نەك دانی مافی وەك یەك بە تاکە تاکەی کۆمەڵگەی نایەکسان

کاربەدەستان و فەرمانڕەوایانی زۆربەی زۆری دەوڵەتەکانی ئەم جیهانە، بە دیمۆکراتی و تۆتالیتێر و ئۆتۆکراتی و ئۆتۆریتێر و ئیلیتێر و لیبەرالەوە، لاف پێدانی **"مافی وەك یەك"** بە هاوولاتە فەرمانە بەسەردا کراوەکانیان‌دا لێ دەدەن، و هێندێکیشیان بە کردەوە لە قانوونە بنچینەیی‌یەکانیاندا دەنووسن کە **"هەموو هاوولاتان، بێ گوێ دانە جیاوازیی رەگەزو زمان و ئاین و رەنگی پێست و بیروباوەڕ و شوێنی کۆمەلایەتی و..هتدیان؛ لەبەردەم قانووندا وەك یەکن"**.

مەبەستیشیان لەمە ئەوەیە؛ کە ئەم **"هاوولاتانە"** هەموو بە یەك چاو لەلایەن دەوڵەت و دەزگەکانی‌یەوە تەماشا دەکرێن. واتە ئەگەر یەکێك **"دەوڵەمەند"** و یەکێك **"هەژار"** بوو، یان یەکێك **"پێستی رەش"** و یەکێك **"پێستی سپی"** بوو، یان یەکێك **"پیاو"** بوو و یەکێك **"ژن"** بوو، یان یەکێك **"خوێندەوار"** بوو، یەکێك **"نە خوێندەوار"** بوو، یان یەکێك **"بەکوردی قسەی کرد"** و یەکێك **"بە ترکی"**؛ ئەوا قانوون بە **"دەوڵەمەندەکە"** و **"سپی پێستەکە"** و **"پیاوەکە"** و **"خوێندەوارەکە"** و **"ترکەکە"**؛ مافی زێتر نادا لە **"هەژارەکە"** و **"رەش پێستەکە"** و **"ژنەکە"** و **"نەخوێندەوارەکە"** و **"کوردەکە"** و ئەمەش بە نیشانەی راستەقینەی **"وەك یەکیی ماف"** و **دیمۆکراسی و داد پەروەریی رژێمی** ئەو دەوڵەتە دەدەنە قەڵەم.

ئێستە ئەگەر کەمێك بە هوردی و بابەتانە لە کێشەکە بکۆڵینەوە، دەبینین ئەم لاف لێ دانەی سەرەوە **"هەموو هاوولاتان لەبەردەم قانووندا وەك یەکن"** کە گوایە نیشانەی **"مافی وەك یەك"**ە لە قسەیەکی بێ سەروپێ بەولاوە هیچی دی نی‌یە، راستی‌یەکەی ئەوانەی وەك یەك نین-واتا هاوشان و هاوکێشی یەك نین- ، بە پێی سروشت و ژێربێژیی شتەکە خۆی، ناشتوانن **"مافی وەك یەك"**یشیان هەبێ. دوو کەس یان دوو کۆمەڵ، تەنێ دەتوانن بڵێن **"مافی وەك یەکمان هەیە"** کە ئەگەر هاتوو ئەو دوو کەسە یان ئەو دوو کۆمەڵە؛ **"هاوشان و هاوکێشی یەك"**بن؛ واتە **"یەکسان"** بن، **"یەکسانی"** مانای **"یەکسانی نی‌یە لە بوونی مافدا"** **بەڵکو** مانای **"یەکسانی‌یە لە مافی بەکارهێنانی ماف"** و **"یەکسانی لە سووت وەرگرتن لەو بەکارهێنانە"**دا. چۆنکە **"ماف"**، کاتێك سووتی دەبێ، کە بتوانرێ

بەکاربهێنرێ و هیچ مافێك سووتی نابێ ئەگەر بەکار نەهێنرێ، یان نەتوانرێ بەکار بهێنرێ. لەبەر ئەوە ئەگەر تۆ نەتتوانی مافێك کە هەتە بەکاری بهێنیت، ئەوا وەك نەتبووبێ وایە، بۆ وێنە: ئەگەر تۆ بە ملوێن پارەت لە بانکدا هەبێ، بەڵام نەتوانیت؛ واتە ماف ئەوەت نەبی دەری بهێنیت و خەرجی بکەیت؛ ئەوا وەك نەت بووبێ وایە. کەواتە "**ماف نابێتە ماف**" هەتا "**دەسەڵاتی بەکارهێنان**"یت نەبێ. بەڵام کە دوو کەس، یان دوو کۆمەڵ "**دەسەڵات**"یان لە لەبەکارهێنانی "**ماف**"ێکدا هەبوو، مانای وانی‌یە ئەنجامی بەکارهێنانی ئەو مافە هەر وەك یەك دەردەچێ. چۆنکە **چەندایەتی** و **چۆنایەتیی** ئەو ئەنجامە لەسەر رادەی توانستی سووت وەرگرتن لەبەکارهێنانی ئەو مافە وەستاوە.

جا لەبەر ئەوە و بۆ ئەوەی دوو کەس "**مافی وەك یەك**"یان هەبێ؛ دەبێ یەکەم: هەردووکیان "**دەسەڵات**"یان لە "بەکارهێنانی ئەو مافە هەبێ و دووەم: دەبێ هەردووکیان "**دەسەڵات**"یان لە "**سووت وەرگرتن لەو مافە**"دا وەك یەك بێ. واتە دەبێ ئەو دوو کەسە ببنە "**هاوشان**" و "**هاوکێش**"ی یەك تا ببنە خاوەنی "**مافی وەك یەك**".

بۆ وێنە: کە دوو قوتابی دێنە قوتابخانە؛ یەکێکیان زارۆی خێزانێکی هەژار و ئەوی دی زارۆی خێزانێکی دەوڵەمەند، یەکەمیان بە زگی برسی و جلکی دڕاو و شەرمێکی زۆری هەڤاڵ کەمی‌یەوە دێتە بەردەم مامۆستا، و ئەوی دی‌یان بە زگی تێر و جلکی جوان و کەشوفشێکی دەست رۆیشتووانەوە دێتە بەردەم مامۆستا، ئەم دووانە: ناتوانن وەك یەك لەگەڵ مامۆستاکەیان وتووێژ بکەن و سووت وەربگرن لێی؛ با قوتابخانەکە و مامۆستاکانیش لە بنچینەوە بە یەکچاو تەماشای زارۆی هەژار و زارۆی دەوڵەمەند بکەن و بە هەردووکیان ماف وەك یەك رەوا ببینن. بەڵام زارۆ هەژارەکە بەو حاڵەی کە لە سەرەوە باسکرا؛ ناتوانێ سووت لە مافی خۆی وەربگرێ وەك زارۆ دەوڵەمەندەکە؛ چۆنکە "**هاوشان و هاوکێشی**"ی زارۆ دەوڵەمەندەکە نی‌یە و ئەوەندەی ئەو دەستی ناڕوا و دەسەڵاتی نی‌یە.

هەروەها کە ژن و پیاوێك شەڕێکیان دەبێ و دێنە بەردەمی حاکمێك لە وڵاتێکی دواکەوتووی پیاو فەرمانی‌دا، پیاوەکە بە دەسەڵات و دەم هەراش و دەنگ دلێر و لە خۆ دڵنیا، و ژنەکەش بێ دەسەڵات و دەنگ خنکێنراو و شەرمن و کەنفت کراو، ئەوا ناتوانن وەك یەك مەسەلەکەیان لە حاکمەکە بگەیەنن. با حاکمەکەش هەردووکیان لە بنچینەوە بەیەك چاو تەماشا بکات و ماف وەك یەك

ڕەوا ببینێ پێیان. ژنەکە بەو حاڵەی باسکرا، ناتوانێ سووت لە مافی خۆی وەربگرێ وەك پیاوەکە، چۆنکە ژنەکە "**هاوشان و هاوکێشی**"ی پیاوەکە نییە. واتە ئەوەندەی پیاوەکە دەستی ناڕوا و ئەوەندەی ئەو دەسەڵاتی نییە.

بە کورتی: "**مافی وەك یەك**" کاتێك دەبێتە واقعێکی هەست پێکراو کە ئەوانەی ئەو مافە ڕەوا دیتراوە پێیان؛ یان خۆیان بتوانن؛ یان دەسەلات پەیدا کرێ پێیان؛ تاکو ئەو مافە وەك یەك بەکار بهێنن و وەك یەك سووت وەربگرن لە بەکارهێنانی. کەواتە بەکارهێنانی وەك یەکیی ماف و سووت وەرگرتنی وەك یەك لێی؛ پێویستییان بە بوونی دەسەلاتی وەك یەك هەیە، دەسەلاتی وەك یەکیش کاتێك دەبێتە کردار، کە ئەوانەی ئەو دەسەلاتە بەکار دەهێنن هاوکێش و هاوشانی یەکبن؛ واتە "**یەکسان**"بن.

کەواتە کاتێك دەتوانرێ باسی "**وەك یەکیی ماف**" لە کۆمەڵگەدا بکرێ، کە ئەو کۆمەڵگەیە "**یەکسان**" بێ. کۆمەڵگەیەك کە لە ڕووی ئابووری و ڕۆشنبیرییەوە لە چەند چینێك و دەستەیەك وتوێکێکی جیاواز پێك هاتبێ، دیارە ئەندامەکانی هاوشان و هاکێشییەك نابن، لەبەر ئەوە دەسەلاتیشیان لەبەرکارهێنانی ماف و سووت وەرگرتن لەو بەکارهێنانە، وەك یەك نابێ، لەبەر ئەوە هەزاران قانوون و نەریت دروست ببێ بۆ پشتگیریی دانی مافی وەك یەك بە ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵگەیە؛ هیچ سووتێکی نابێ و لە وشەی سەر کاغەز بەو لاوە چی دی نابێ.

بۆ وێنە: لە هێندێ لە دەوڵەتەکانی ئەورووپای ڕۆژاوادا قانوونی زۆر دێموکراتانە و ئازادیخوازانە هەن؛ کە مافی وەك یەك بە ئەندامانی کۆمەڵگەی ئەو وڵاتانە ڕەوا دەبینن، بەڵام تاك و چین و توێك و دەستە جۆرجۆرەکانی کۆمەڵگە کەڵك لەو قانوون و مافانە، وەك یەك، وەرناگرن. بۆ نموونە: یەکێك لە بنچینە سەرەتاییەکانی سیستەمی لیبەرالی "**ئازادیی پەیمان بەستن**"ە. واتە کرێکارێك مافی ئەوەی هەیە لای ئەم خاوەن فابریقەیە کار نەکات، بەڵکو لە لای ئەو خاوەن فابریقەیە کاربکات؛ بە کورتی کرێکارەکە ئازادە لەگەڵ چ کارپێ دەرێکدا بیەوێ؛ دەتوانێ پەیمانی کارکردن ببەستێ. بەڵام ئەگەر تۆزێك بە هوردی لەمە بکۆڵینەوە؛ دەبینین کە کرێکار لەم پەیمان بەستنەدا لەگەڵ سەرمایەدار "**ئازاد**" نییە، وەك قانوون دەڵێ. چۆنکە کرێکارێك کە ناچارە هێزی لەشی بە پارە بفرۆشێ، ناتوانێ بە ئارەزووی دڵی خۆی پلەی کرێ و جۆری کار و کارپێدەر بۆ خۆی هەڵ بژێرێ. چۆنکە ئەو کەسەی کرێکارەکە بە پارە ڕادەگرێ سەرمایەدارەکەیە، و کرێکارەکە ناتوانێ ماوەیەکی زۆر بێ کار بمێنێتەوە؛

چۆنکە لەبرساندا دەمریٚ. بەڵام سەرمایەدارەکە دەتوانیٚ بەهۆی پارەکەیەوە، ئەگەر هاتو کۆمەڵە کریٚکاریٚك مانیان گرت لیٚی و کاریان نەکرد بۆی، ئەوا رابوەستیٚ و چاوەڕوان بکات، تا کریٚکارەکان ناچار دەکات بە مەرجەکانی رازی بن. بە کورتی ئەو "**دەسەلات**"ەی سەرمایەداریٚك هەیەتی، کریٚکاریٚك نییەتی. کەواتە ئەو پەیمانەی لە نیٚوان پارەداریٚك "**بەدەسەلاتیٚك**" و "**بیٚ دەسەلاتیٚك**"دا دیٚتە بەرهەم؛ پەیمانیٚك نییە کە لە نیٚوان دوو کەسی هاوکیٚش و هاوشاندا هاتبیٚتە بەرهەم، لەبەر ئەوە با قانوونیش هەردووکیان وەك یەك تەماشا بکات، لەگەڵ ئەمەشدا سەرمایەدار باشتر دەتوانیٚ کەڵك لە "**مافی ئازادیی پەیمان بەستن**" وەربگری وەك لە کریٚکار. ئەمجا با چەند ویٚنەیەکی کەمیٚك هاسانتر بهیٚنینەوە:

کاتیٚك پارەداریٚك لەگەڵ هەژاریٚکدا لەسەر شتیٚك ناکۆکی دەکەویٚتە نیٚوانیان و دۆزەکە دەگاتە دادگە، پارەدارەکە بەهۆی دەسەلاتی پارەکەیەوە دەتوانیٚ لە باتی پاریٚزکاریٚك (محامی) چەند پاریٚزکاریٚکی زۆر شارەزا رابگریٚ و لە کابرای هەژاری دەستکورتی لە قانوون نەزان؛ گەلیٚك باشتر سووت لە پیٚچ و پەناکانی قانوون و مافەکانی خۆی وەربگریٚ و کیٚشەیەك کە بە ماوەیەکی کورت تەواو ببیٚ؛ وای دوور بخاتەوە و وای سەخت بکا؛ کە پرزە و هەناسە لەبەر هەژارە دەستکورتەکە ببڕیٚ و لە ئەنجامدا کۆڵ بە هەژارەکە بدات و دۆزەکە بباتەوە، با هەژارەکەش لەسەر هەق بیٚ و قانوونیش پشتی بگریٚ. هەروەها کابرایەکی خویٚندەواری ئەکادیمیکەری شارەزای تیٚکنۆکراتی؛ باشتر دەتوانیٚ کەڵك لە قانوون و مافی خۆی وەربگریٚ وەك لە یەکیٚك کە خویٚندنیٚکی بەرزی زانستگەییی تەواو نەکردبیٚ و شارەزای کاروباری بیٚرۆکراتی و پیٚچو پەنای قانوون نەبیٚ.

جا هەرچەندە بەپیٚی قانوونی رژیٚمە لیبەراڵییەکان خەڵك ئازادن لە دەربڕینی بیروباوەڕدا و مافی ئەوەیان هەیە بە سەربەستی بیروباوەڕی خۆیان دەربڕن؛ بەڵام ئەو خەڵکە هەموویان دەسەلاتی ئەوەیان نییە ئەم مافە وەك یەك بەکاربهیٚنن. ئەوانەی هەژارو دەستکورت و بیٚ سەرمایەن؛ لەوە زیٚتر کە بیروڕای خۆیان بە چەند کەسیٚکی دەوروپشتی خۆیان رابگەیەنن، یان لە سنووریٚکی زۆر تەنگدا بلاوی بکەنەوە؛ ماوەی دیکەیان نییە. بەڵام ئەو کۆنسیٚرنانەی کەوا دەستاویٚژی چاپ و چاپەمەنییان بەدەستەوە هەیە، و هەموو رۆژیٚك بە ملویٚن دانە رۆژنامە و گۆڤار و پەخشنامە بلاودەکەنەوە؛ زۆر چاك دەتوانن بەهۆی ئەو

ڕۆژنامە و گۆڤار و پەخشنامانەوە کە دەری دەکەن؛ کاربکەنە سەر بیروڕای گشتیی خەڵك و سەرنجیان بگۆڕن و چەواشەیان بکەن و هەق بکەن بە ناهەق و ناهەق بکەن بە هەق لێیان، کە ئەم کارە لە دەسەڵاتی ئەوانەدا نییە کە خاوەنی کۆنسێرن و چاپخانە و داودەزگەی ڕۆژنامەگەری و پەخشکاری نین، با لەسەر هەقیش بن و قانوونیش پشتیان بگرێ.

لە چارەکە چەرخی ڕابوردوودا؛ هێندێ لە وڵاتەکانی جیهانی سێیەم بەنێوی "**ریفۆرم**" اصلاحات- ەوە هێندێ "**اجراءاتیان**" نواند؛ وەك دەرکردنی قانوونی چارەسەرکردنی زەوی و زار و قانوونی (**احوالی شخصی**) بۆ مافی ژنان. بەپێی قانوونی یەکەم دەوڵەت هێندێك زەوی و زاری لە خاوەن زەوییە گەورەکان کڕی و بەسەر جۆتکارەکاندا دابەشی کرد. بە پێی قانوونی دووەمیش هێندێ مافی سەرەتایی بە ژنان ڕەوا بینرا. بەڵام نە جۆتکارەکان سووتیان لە مافی "**خاوەن زەویتی**" وەرگرت و نە ژنانیش سووتیان لە مافی "**وەك یەکی**" لەگەڵ پیاودا وەرگرت. ئێران باشترین نموونەیە کە بۆ ئەم قسەیە.

ئەو خاوەن زەوییە گەورانەی زەوییەکانیان بە پارەیەکی یەکجار زۆر لێ کڕا، چوون هەر بەو پارەیە مڵکی دیکەیان کڕی و دەوڵەمەنتر و دەسەڵاتدارتر بوون. جۆتکارە هەژارە بێ پارە و نەخوێندەوار و بێ پشتو پەنا و بێ دەسەڵاتەکانیش؛ چۆنکە توانستی بەڕێوەبردنی زەوییەکانیان نەبوو، پاش ماوەیەك ناچار بوون زەوییەکانیان بەجێ بهێڵن و وەك کرێکارێکی ڕۆژانە بە نانەسکی لە شارە گەورەکاندا کاربکەن و لە جاران هەژارتر بن. ئەو ژنانەش کە دڵی خۆیان بەوە خۆش کردبوو کە خۆیان بەرامبەر پیاو ڕاست بکەنەوە؛ هەر زوو زانیان کە نالوێ بۆیان. کۆمەڵگە بەرامبەریان وەستاو، بە چاوی سووك تەماشایان کرا. چۆنکە ژنەکان دەسەڵاتی ئەوەیان نەبوو بەرامبەر کۆمەڵگەیەکی پیس و پیاو فەرمانی خۆیان ڕابگرن و ناچار بوون سەر بۆ هەزاران قسەی ساردو سووك شۆڕبکەن و لە ئەنجامدا نەك سووتیان لەو فشە مافانە وەرنەگرت؛ بەڵکو بەزیانیشیان تەواو بوو.

کەواتە تۆ کاتێك دەتوانیت باسی "**مافی وەك یەك**" بکەیت؛ کە "**دەسەڵاتی وەك یەك**"ت مسۆگەر کردبێ بۆ ئەو لایەنانەی "**ماف**" ڕەوا دەبینی پێیان. مەبەستیش لە "**دەسەلات**" دەسەڵاتە لە هەموو ڕوویەکەوە: دەسەڵاتی ئابووری، دەسەڵاتی ڕۆشنبیری، دەسەڵاتی چالاکی نواندن، دەسەڵاتی ڕادەربڕین و..هتد.

جا كه تۆ بتەوێت دەسەڵاتی وەك یەك لە هەموو روویەكەوە بۆ كۆمەڵگەیەك پێك بهێنیت؛ ئەوكاتە ناچاریت و هەردەبێ "**كۆمەڵگەیەكی یەكسان**" پێك بهێنیت.

به كورتی: بۆ ئەوەی ماف تاكە تاكەی كۆمەڵگە؛ بەڕاستی وەك یەك بێ، دەبێ "**دەسەڵات**"ی تاكە تاكەی كۆمەڵگە لە هەموو روویەكەوە وەك یەك؛ واتە هاوكێشی یەك بێ. بوونی "**دەسەڵات**" مانای بوونی "**ئازادی**"یە (بگەڕێڕەوە بۆ وتاری ئازادی و دەسەڵات)، نەبوونی "دەسەڵات"یش مانای نەبوونی "ئازادی"یە. دیارە ئەوانەی دەسەڵاتیان وەك یەك نییە، وەك یەكیش "ئازاد" نین.

لەبەر ئەوە دەبێ تاكە تاكەی كۆمەڵگە وەك یەك دەسەڵاتیان هەبێ؛ تاكو بتوانن وەك یەك ئازاد بن لە بەكارهێنانی مافیاندا. جا لەبەر ئەوەی تاكە تاكەی هیچ كۆمەڵگەیەكی ئەم جیهانە ناتوانێ "**ئازاد**" واتە "**دەسەڵات**" بۆ خۆی مسۆگەر بكات، ئەگەر بێتو لە كۆمەڵگەیەكی ئازادی بە دەسەڵاتدا نەژی، پێویستە تاكە تاكەی كۆمەڵگە بەرێككەوتن تەڤییەك و پشتگیری كردنی هەق، هەوڵی "**ئازاد**" و "**دەسەڵات**" بۆ كۆمەڵگە بدەن، "**ئازادی و دەسەڵات**" بۆ كۆمەڵگە، نەك هەر بۆ تاكە تاكەی خۆیان؛ چۆنكە ئەو كەسەی هەر بۆ ئازادی و دەسەڵاتی خۆی هەوڵ دەدات لە كۆمەڵگەیەكی نایەكساندا؛ دەبێ هەموو كاتێك چاوی لەوە بێ كە بە حوكمی سروشتی نایەكسانیی كۆمەڵگە كە، بەربەرەكانێكەر و نەیاری وا پەیدا دەبن بۆی كە لە ئازادی و دەسەڵاتی كەم دەكەنەوە و هێندێ جاریش بە جارێ پێشێلی دەكەن. لەبەر ئەوە هیچ كەسێك ناتوانێ بە تەنێ لە كۆمەڵگەیەكی نائازاددا ئازادبێ و دەسەڵاتی هەبێ و ئازادی و دەسەڵاتەكەشی تاسەر مسۆگەر بكات. تەنانەت ئەوانەی كە زۆر دەست رۆیشتوو پارەدار و ملهوڕن، دەبێ هەمیشە هەر خەریكی ئەوە بن خۆیان بپارێزن و سەر گەرمی بەربەرەكانێ بن تا ئازادی و دەسەڵاتیان بە جارێك لە دەست نەچێ. لەبەر ئەوە تەنێ كۆمەڵگەی یەكسانە كە زامنی ئازادی و دەسەڵاتە هەتا سەر بۆ هەموو تاكێكی كۆمەڵگە و هیچ تاكێك نامێنێ كە لە دەست دانی ئازادی و دەسەڵاتی خۆی بترسێ. دیارە ئەو دەمە هیچ تاكێك ئازادی و دەسەڵاتی لە تاكێكی دی زێتر نابێ.

لە كۆمەڵگەیەكی وادا كە ئازادی و یەكسانی هاوكێش و تەواوكەری یەك بن؛ دیارە ئەو كۆمەڵگەیە ناتوانێ بە دەوڵەتێك رازی بێ كە ئەو دەوڵەتە نوێنەری چینێكی تایبەتی یان دەستەیەكی تایبەتی یان توێكێكی تایبەتی یان

کەسێکی تایبەتی بێ. چۆنکە هەموو فەرمانڕەواییەکی چینایەتی یان دەستەیەتی یان توێکایەتی یان کەسایەتی؛ نایەکسانی دەگەیەنێ. هەروەها ناتوانێ بە دەوڵەتێك رازی بێ کە لاڤ ئەوە لێ بدا کە سەر بە هیچ چینێك و دەستەیەك و توێکێك و کەسێك نییە؛ بەڵکو هێزێکی بێ لایەنە بۆ یەکخستن و نێو بژی کردنی چین و دەستە و توێکە جۆرجۆرەکانی کۆمەڵگە؛ چۆنکە دەوڵەت نابێ خۆی لە کۆمەڵگە جیا بکاتەوە و لە بۆشایی ئاسماندا بسووڕێتەوە. هەروەها نێوبژی کردنی نێوانی بە دەسەلاتێك و بێ دەسەلاتێك، مانای هێشتنەوەی بە دەسەلاتی و بێ دەسەلاتییە وەك خۆی. دەوڵەت دەبێ لە کۆمەڵگە خۆی بێ و بۆ کۆمەڵگە خۆی بێ؛ واتە نە لە سەروو کۆمەڵگەوە بوەستێ و قامچی بەدەستەوە بگرێ لێیان، و نە لە نێوەڕاستیاندا بوەستێ و بە درۆ نێوبژییان بکات و کەچی بە کردەوەش لەگەڵ لایەکیان بێ. بە کورتی دەوڵەت دەبێ کۆمەڵگەکە خۆی بێ، بێ کەمو زیاد. ئا لەم جۆرە دەوڵەتەدایە کە کەڵەگایی و ترسی پاشەڕۆژ و زوڵمو زۆر نامێنێ. شایانی باسە لێرەدا کە لە کۆمەڵگەیەکی یەکسانی وادا دەوڵەت لە نێو ناچێ و نامرێ، بەڵکو کۆمەڵگە خۆی دەبێتە دەوڵەت. واتە "**ئازادیی کۆمەڵگە**" دەبێتە "**دەسەلاتی دەوڵەت**". بە کورتی کۆمەڵگەی ئازادی یەکسان؛ دەسەلاتی خۆی لە شێوەی دەوڵەتدا دەردەبڕێ.

ئەوسا دەوڵەت و کۆمەڵگە وەك پارچە پارەیەکیان لێ دێ کە دیوێکی پارەکە ئازادییە و دیوێکی دەسەلاتە و ئەو دەمەش "**دەوڵەت وەك دەوڵەت**" پێویست نامێنێ.

# بیروباوەڕی سیاسی لە نێوان ستراتیژو تاکتیکدا

"**سیاسەت**" لەباری سەرنجی هاوبیرانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزمەوە، بریتی‌یە لە زانست و هونەری گۆڕینی کۆمەڵگەیەك لە بارێکەوە بۆ بارێکی دی. گۆڕینیش؛ بەشێوەیەکی گشتی، دوو جۆرە: یەکەمیان - گۆڕینێکی رووالەتە و پێوەندیی بە دیوی دەرەوەی کۆمەڵگەوە هەیە. بۆ وێنە: گۆڕینی داوودەزگەی میری لە وڵاتێکدا؛ بەوەی ئەوانەی کاربەدەستن لایان ببەیت و هێندێکی دیی هەروەك ئەوان، بخەیتە جی‌یان. بۆ نموونە: دەستەیەك بکەونە یەك و ئاژاوەیەك بنێنەوە و شایەك کە لەسەر تەختە لای ببەن و سەرەك کۆمارێك دابنێن لە جێی وی؛ بیٚ ئەوەی سیستەمی فەرمانڕەواییی وولات لە بنەڕەتەوە بگۆڕن. یان ئەوەی چەند ئەفسەرێك کودەتایەك چیٚ بکەن و دەستبەجیٚ. هێندیٚ ریفۆرمی (اصلاحات) سەر پێیی (سطحي) بخەنە کار؛ وەك ئەوەی نرخی بژێو (ارزاق) ببڕن و، هەر کەسێك گرانتری فرۆشت؛ سزای بدەن و، مانگانەی مووچە خۆران بەرز بکەنەوە؛ ئەمە بیٚ ئەوەی دەسکاری سیستەمی ئابووری‌یان کردبیٚ. یان ئەوەی فەرمانڕەوایەك لە کۆمەڵگەیەکی پیاو فەرمانی‌دا فەرمان دەربکا و بڵیٚ هیچ ژنێك نابیٚ پەچەبگرێتەوە و گوایە ئەمە بە "**یەکسانیی پیاو و ژن**" بزانێت، یان ئەوەی کاربەدەستان لە کۆمەڵگەیەکی دەرەبەگی و خاوەن زەوی و زاردا هێندیٚ زەوی و زار لە دەرەبەگەکان بسێننەوە، یان لێیان بکڕن و دابەشی بکەن بەسەر جوتکارە بیٚ زەوی‌یەکاندا؛ بیٚ ئەوەی دەسەڵاتی ماددی و مانایی بدەن پی‌یان بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان. یان ئەوەی هەوڵ بدریٚ گەلێکی پارچە کراوی نیشتمان بەشکراوی فەرهەنگ پی‌شێل کراو کە داوای مافی چارەنووس و قەوارەی ناسیۆنالی خۆی دەکا؛ بەکردنەوەی چەند قوتابخانەیەك بە زمانی ئەو گەلە و دەرکردنی یەك دوو گۆڤار و رۆژنامە بەو زمانە؛ دابین بکریٚ و ئەمەش بە نیشانەی "**برایەتی**"ی گەلی داگیر کراو و گەلی داگیرکەر دابنریٚ.

ئەمانەی لەسەرەوە باسمان کردن هەموو وێنەی جۆرجۆری گۆڕینی رووالەت و دیوی دەرەوەی کێشەکەن و هاوبیران پی‌یان رازی نابن.

گۆڕینی دووەم گۆڕینێکی بنچینەیی‌یە؛ واتە گۆڕینی باری وێستاو (الوضع الراهن) لە رەگوبنجەوە. دە هاوبیران لەگەڵ ئەم جۆرە گۆڕینەدان؛ بەڵام دیارە

لەباری سەرنجی بیروباوەڕی خۆیانەوە. لەم ڕووەوە هاوبیران چەند نموویەك دێننەوە: (کە لیّمان بپرسن: دەوڵەتی کۆماریتان بەدڵە یان دەوڵەتی شا ڕژێمی؟ دەڵێین: ئێمە جاریّ بەر لە هەموو شتێك تەماشای نێو و نیشانە و دیوی دەرەوە و توێکلی هیچ دەوڵەتێك ناکەین؛ بەڵکو تەماشای دیوی نێوەوە و نێوەڕۆکی ئەو دەوڵەتە دەکەین. ئێمە دەوڵەتێکمان بەدڵە کە نوێنەری ڕاستەقینەی ئەو مرۆڤانە بیّ کە لە چارچێوەی ئەو دەوڵەتەدا دەژین، دەوڵەتێك کە دانیشتووانی نێو سنوورەکەی لە قووڵاییی هەستی هۆشیارانەی خۆیانەوە بەوپەڕی ئازادی بڕیاریان لەسەر دامەزراندنی دابیّ و هەر کاتێك کە خەڵکە ئازادەکەی؛ حکوومەت و دەزگەی بەڕێوەبەرێتیی "ئەو دەوڵەتەیان بەدڵ نەبوو؛ ئەوا بتوانن دەستبەجیّ لای ببەن و بیهێننە خواریّ. دەوڵەتێك کە فەرمانڕەواکانی داردەستی گەلە هۆشیارە ئازادەکەی بن؛ نەك گەلەکە داردەستی ئەوان بیّ.

دەوڵەتێك کە وەزیفەی بنچینەیی ئەوە بیّ **"کۆمەڵگەیەکی یەکسان"** لە ڕێی فراوانکردن و پڕوچڕ کردن و تەواو کردن و پاراستنی ئازادییە تایبەتییەکان و گشتییەکانەوە بهێنێتە دی و نەتوانیّ خۆی بکات بە ملهوڕی کۆمەڵگە؛ بەڵکو خۆی و کۆمەڵگە بکاتە یەك. ئا ئێمە ئەو جۆرە دەوڵەتەمان دەویّ. ئەگەرنا تۆ بچیت بە چوار پێنج ئەفسەر لە شەوێکی تاریکدا شایەك بهێنیتە خواریّ لەسەر تەخت و بەنێوی ئەوەوە کە زۆرداربووەو خۆی و خاووخێزانی بەسەر ورگی گەلێکی بیّ چارەوە زەلاونەتەوە و، سەر کۆمارێك بخەیتە جێی وی کە ئەویش هەر وەك شاکە دیکتاتۆر و ملهوڕبیّ و ئەویش چەند ساڵێك خۆی و خێزان و دارودەستەی لەسەر ورگی هەژار و ڕووتەی ئەو گەلە بلەوەڕێن، دەبیّ جیاوازیی ئەم دوو جۆرە دەوڵەتە چی بیّ لە نێو زێتر؟. کابرایەکی دز و جەردە بابڵێین نێوی **"بلە"** بیّ؛ تۆ بچیت نێوەکەی بگۆڕیت بە **"جلە"**؛ ئەمە هەر ئەو کابرایەیە؛ واتە هەر **"بلە"**کەیەو نەگۆڕاوە. جا ئەگەر مەلیکێك ڕووتت بکاتەوە، یان سەر کۆمارێك؛ ئەوە بۆ تۆ هەریەکە. وەك کوردەکە دەڵیّ: **"بۆ کوردی هەژار، چ گورگ و چ سوار"**. **شا فەیسەڵ** دیلت بکا، یان **ژەنەراڵ قاسم**، **سەرکۆمار عارف**، یان **سەرۆکی فەرماندە سەددام**؛ ئەوە بۆ تۆ هەریەکە. دیلی هەر دیلییە. کەواتە **خەلیفە و سوڵتانی ترکی عوسمانی** دیلت بکا و دات بدۆشی، یان **ئەتاترك و گویرسەل و ئیڤرەن**؛ کە هەریەکەیان **ژەنەراڵ و سەرکۆمار** بوون؛ ئەوە بۆ تۆ هەر یەکە؛ دیلی هەر دیلییە. بە کورتی: کەرەکە هەر کەرەکەی جارانە، تەنیّ کورتانەکەی

گۆڕاوە. دە ئێمە بەم جۆرە گۆڕینە لە فەرمانڕەوایی‌دا دڵ خۆش ناکەین، چۆنکە بەمە کێشەی فەرمانڕەوایی، لە بنچینەوە، چارەسەر نەکراوە. بەڵێ ڕاستە؛ ئێمە لە بنەڕەتەوە دژی ڕژێمی شایەتین، لە کاتێکدا لە بنەڕەتەوە دژی ڕژێمی کۆماری نین. چۆنکە ڕژێمی شایەتی مافێك دەداتە دەست خێزانێك کە پشتاو پشت بەکاری بهێنێ و لە باوکەوە بۆ کوڕەکەی بمێنێتەوە. بەڵام هەرچی ئێمەین پێمان وایە هیچ مافێك بە (وراثة) نی‌یە؛ بەڵکو هەموو مافێك دەبێ لەسەر بنچینەی لێ وەشاوەیی ئەو کەسە خۆی بێ. ئێمە باوەڕمان بەوە نی‌یە کە ئەگەر تۆ دانسازێکی باش بوویت؛ کوڕەکەشت هەر دانسازێکی باش دەربچێ، یا هونەری دانسازیش بخوێنێ.

با بڵێین گەلێك دەنگ دەدا بە یەکێك کە ببێتە شا و ئەم دەنگەش بە هەق دەدا؛ لەگەڵ ئەوەشدا مەرج نی‌یە کوڕی ئەو شایە وەك باوکی لێ هاتووبێ. بە کورتی ئێمە، لەبەر ئەوەی باوەڕمان بە هیچ مافێکی پشتاوپشتی و خێزانی نی‌یە؛ ڕژێمی شایەتی بەڕژێمێکی دژ بە ئازادیی مرۆڤ دادەنێین و لە دژین. ئەمەوا و خۆ ئەگەر سەرکۆمارێکیش هەر وەك شایەك دیکتاتۆرو زۆردار بوو؛ ئەوا بۆ ئێمە هەردووکیان وەك یەکن.

وێنەیەکی دی: با بڵێین چەند ئەفسەرێك بچن کودەتایەك چێ بکەن لە وڵاتێکی دوواکەوتووی گەل برسی‌دا کە ئاژاوە و پشێویی تێ کەوتبێ و خەڵکەکەی دژی ڕژێمی فەرمانڕەوایی ڕاست بووبنەوە، ئەمجا ئەم چەند ئەفسەرە بۆ خۆشەویستکردنی خۆیان؛ دەستبەجێ بکەونە نرخ بڕینی شتومەك و هەرزانکردنی کەلوپەل، وەك ئەوەی لەساڵی ۱۹۵۲دا **ژەنەڕاڵ نوورەدین مەحموود لە عێراق** کردی، کە چوو نرخی توورو گێزەرو شێلمی بڕی؛ هەر ئەو ڕۆژەی کە بە فەرمانی شا فەیسەڵ هاتە سەرکار و ئەمەش لە ئەنجامی ئەوەدا کە کۆمەڵانی خەڵك هاتنە سەرجاددەو داوای نان و کارو ئازادی‌یان دەکرد، و دژی ئیمپریالیزمی بەریتانیایی درۆشمی بەربەرەکانی‌یان بەرزکردبووەوە، بووبوونە هۆی ڕووخاندنی حکوومەتی ئەوکاتە. دە ئێمە گاڵتەمان بەم جۆرە گۆڕینە دێ و هەزار ئافەرم لەو کابرا مەردە دەکەین کە ئازایانە هەر پاش بڵاوکردنەوەی بڕینی ئەم نرخانە، بۆ پێکەنین تەڵگۆرافێکی بۆ **نوورەدین مەحموود** لێ دابوو و نووسیبوی "**تسعيركم الشلغمَ أثلَجَ صدورنا. سيروا على بركة الله والشعبُ من ورائكم**". ئێمە کە بە گۆڕینی لەم بابەتە گاڵتەمان دێ؛ لەبەر ئەوەیە کە ئەم گۆڕینە گۆڕینێکی بنچینەیی ژیانی ئابووری نی‌یە. چۆنکە گران بوونی

شتوومەك لە بنەڕەتەوە، بەدەست چەند بەقاڵ و سەوزەفرۆش و میوە فرۆشێك نیيە. گران بوونی بژێو و پێداویستەكانی ژیان، هۆكار (عامل)ی قووڵتری هەیە كە پێوەندیی بە سیستەمی ئابووری و سیاسیيەوەیە. لەبەر ئەوە هەموو نرخ برینێكی دەستكرد و بەزۆر؛ دەبێتە هۆی شاردنەوەی كەلوپەل و بژێو و كووتاڵ و بەتایبەتی جۆرە باشەكانی و فرۆشتنیان بە دزيیەوە و ئەوجا بە نرخێكی یەكجار گرانتر لە نرخە كۆنەكەی و، بێ بەشكردنی زۆربەی زۆری گەل لێی. كەواتە مرۆڤ بەم هەرزان كردن و نرخ بڕینە كوتوپڕ و زۆردارەكيیە؛ هیچ كارێكی باشی نەكردووە، واتە كێشەكەی لە بنچینەوە چارەسەر نەكردووە. هەروەها بەرزكردنەوەی مووچەی فەرمانبەران؛ بێ بەرز كردنەوەی راددەی ژیانی ئابووریی گەل؛ دەبێتە هۆی گران بوونەوەی نرخی شتومەك و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی زۆربەی زۆری گەل كە فەرمانبەر نین و لە چینی زەحمەتكێشن بكەونە تەنگاويیەوە.

هەروەها لابردنی پێچەی سەر رووی ژنان بە فەرمانێكی كوتوپڕی كاربەدەستان، وەك ئەوەی **رەزاخان لە ئێران و ئەتاترك لە دەوڵەتی تركیا** كردیان و ئەمەش لە دوو كۆمەڵگەی پیاو فەرمانی و دوواكەوتوودا؛ كارێكی رووالەتە. ژن لە هەموو وڵاتێكی جیهاندا، تەنانەت لەو جێیانەدا كە زۆر خۆیان بە پێشكەوتوو دادەنێن؛ ماف وەك مافی پیاو نيیەو سا بە جۆرێك لە جۆران بەشخوراو و چەوساوەیە. تۆیەك كە پێچە لە رووی ژن بەزۆر دادەگریت و ئەوەش لە كۆمەڵگەیەكدا كە هەزاران ساڵە كۆمەڵگەی پیاو فەرمانيیە؛ بێ ئەوەی پێش ئەوە هیچ كارێكت كردبێ كە لەو رێیەوە شێوەی پەروەركردنی پیاوت گۆڕیبێ كە بە یەكسانی و وەك یەكی خۆی و ژن رازی بێ و بێ ئەوەی ژنیشت واڵێ كردبێ ئەوەندەی زات پەیداكردبێ كە بتوانێ لەسەر مافی خۆی هەڵبداتێ و بێ ئەوەی كۆمەڵگەت واڵێ كردبێ كە پشتی ژن بگرێ و لەسەر مافەكانی بەدەنگبێ؛ دیارە ئەو دەمە بەلابردنی پێچە هەر كوێرەوەری و بەڵات بۆ ژنی بەسزمان دروست كردووە و هیچی دی. لەبەر ئەوە كە لە ئێمە بپرسن "**ژن پێچە بگرێتەوە یان بە زۆر پێی لابرێ؟**" دەڵێین: لای ئێمە كێشەكە بەم رووالەتە نيیە و بنچینەيیيە. لای ئێمە ژن و پیاو نيیە لای ئێمە تەنیا مرۆڤ هەیە و بەس. ژنیش مرۆڤێكە وەك پیاو، دەبێ هەر وەك پیاو بڕیاری چارەنووسی خۆی بەدەست خۆی بێ. هەرچيیەك لە كۆمەڵگەیەكی ئازادی یەكساندا بۆ پیاو باشەو بە پیاو رەوایە؛ دەبێ بۆ ژنیش باش بێ و پێی رەوابێ

و ئەوەی بۆ ژن خراپەو ناڕەوایە؛ دەبێ بۆ پیاویش خراپ بێ و ناڕەوابێ. نە بۆ پیـاو هەیـە ببێتـە زۆردار و کەڵـەگای ژن و نـەبۆ ژنیش هەیـە ببێتـە زۆردار و چەوسێنەرەوەی پیاو. ئێمـە باوەڕمـان بـە کۆمەڵگەیـەکی یەکسـانە و هـەر بـۆ ئەوەش تێ دەکۆشین.

ئێمە ناڵێین **"ژن و پیاو"**، بەڵکو دەڵێین **"کۆمەڵگـە"**. **"کۆمەڵگـە"** ژن و پیاو و زیاتریش لـە ژن و پیاو دەگرێتـەوە. بۆ وێنـە "زارۆ"یش هەیـە کـە مافی ئـەویش دەبێ بپارێزرێ؛ ئـەویش هـەر بەشـێکە لـە کۆمەڵگـە. ئێمـە کۆمەڵگـە بـە یەکـە (وحدة) یەکی تەواوی لە پارچە پارچەکردن نەهاتوو دادەنێین. کەواتە کێشـەی ژن بەلای ئێمەوە کێشـەی بەزۆرە ملـێ هـەڵگرتن یان بـەزۆر پـێ داگرتـنی پێچـە نی‌یە، بـەڵکو کێشـەیەکی بنچینـەیی‌یـە کـە کێشـەی یەکسـانیی ژن و پیـاوە لـە کۆمەڵگەیـەکی یەکسـاندا. لەبەر ئـەوە ئێمـە دڵ بـەو جـۆرە گۆڕینـە رووالەتانـە خۆش ناکەین.

هەروەها کە دێینە سەر باسی نەتەوەیەك کە هێشتا بە سەربەخۆیی خۆی نەگەیشـتووە و لێمـان دەپرسـن دەبـێ بـەو گەلـە **"ئۆتۆنۆمـــی"** بـدرێ یـان **"سـەربەخۆیی"**؟. ئێمـە دەڵـێـین: دۆزەکـە بـەلای ئێمـەوە دۆزی شـێوەی قـاڵب و چوارچێوە نی‌یە؛ بەڵکو دۆزەکە بەلای ئێمەوە دۆزێکی بنچینەیی‌یە. ئێمـە لـە ئازادی‌یەوە دەست پـێ دەکـەین کـە ئەمـە سـەرەتایەکەو لێوەی دەردەچین. جـا ئەوکەسەی کە ئەم پرسیارە لـە ئێمە دەکات؛ یان ئەوەتـە بـاوەڕی بـە ئـازادیی مرۆڤ نی‌یە، یان ئەوەتە باوەڕی بە ئازادیی مرۆڤ هەیە. جا ئەگەر باوەڕی بە ئازادیی مرۆڤ نی‌یە؛ ئەوا ئێمە لێرەدا دەمەتەقێمان نامێنێ لەگەڵی. خۆ ئەگەر باوەڕی بـە ئـازادیی مـرۆڤ هەیە؛ دەبـێ بـاوەڕی بە ئـازادیی مـرۆڤ هـەبێ؛ بـێ چەند و چۆن. چۆنکە بە لای ئێمەوە هیچ مرۆڤێك مافی ئەوەی نی‌یە ئازادی بدا بە مرۆڤێکی دی. هەر مرۆڤێك تا ئێستە لە دایك بوون؛ یان لەوە دوواوە لە دایك دەبن؛ هەموو وەك یەك بە رووت و قووتی هاتوونەتە جیهانـەوەو هـەمووش وەك یەك مردوون و دەمرن.

لەبەر ئەوە ئازادی بە هەریەکێکیان وەك ئەوی دی‌یان رەوایە بێ زیادو کەم. هەر لەبەر ئەوەشە کە هیچ گەلێك مافی ئەوەی نی‌یە ئـازادی بـدا بـە گـەلێکی دی، یان رێی ئازادی بگرێ لێی. چۆنکە گـەلانی جیهان مـافی ئازادی‌یان لـەو رۆژەوە دەست پـێ دەکا کە پەیدا دەبن. جا چۆن دۆزی ئـازادیی مرۆڤێـك **"چـەندوچۆن"** هەڵ ناگرێ؛ هەروەها دۆزی ئازادیی گەلێکیش **"چەند و چـۆن"** هـەڵ نـاگرێ. بۆ

وێنە: ئەگەر لە تۆیان پرسی **"ژنەکەت زگی پڕە یان نا؟"** تۆ تەنیا دەتوانیت بڵێیت **"زگی پڕە"** یان **"زگی پڕ نی‌یە"**. ئەگەر گوتت **"کەمێك زگی پڕە"** یان **"تا هەندازەیەك زگی پڕە"** قسەی قۆڕە، ئەوا هەر بەم جۆرە ناتوانیت بڵێیت **"مرۆڤێك"** دەبێ **"تا هەندازەیەك"** ئازادبێ، یان **"گەلێك"** دەبێ **"تاهەندازەیەك"** ئازادبێ. گەلان بریتین لە کۆمەڵە مرۆڤ و دەبێ یان **"ئازاد"** بن یان **"ئازاد"** نەبن. جا کە تۆ گوتت فلانە **"مرۆڤ"** یان فیسارە **"گەل"** تا **"فلانە هەندازە"** یان **"فیسارە پلە"** مافی بەکارهێنانی ئازادیی خۆی هەیەو بەس، مانای وایە کە تۆ بۆ **"ئازادی"** کە مافێکی **"مطلق"**ەو **"چەند و چۆن"**ی لەسەر نی‌یە و بۆ هەموو مرۆڤ و گەلێك وەك یەکە، سنوور دادەنێیت؛ بە کورتی تۆ لە رێزو ماف و قەدەری مرۆڤ؛ دێنیتە خوارێ، ئەمە لە کاتێکدا کە خۆشت مرۆڤێکیت و خودێ نیت. جا لەبەر ئەوەی ئێمە هیچ مرۆڤێك لە مرۆڤێکی دی لە بنەڕەتەوە زێتر نابینین؛ دیارە دەڵێین دەبێ دان بنرێ بەوەدا کە گەلی کورد هیچی لە گەلەکانی دیکەی جیهان نەکەمترە و نەزێترە، لەبەر ئەوە دەبێ دان بنرێ بەوەدا کە گەلی کورد بە **"ئازادی"** مافی ئازادیی خۆی بەکاربهێنێ. واتە بڕیار لەسەر چارەنووسی خۆی بدا. چۆنکە ئێمە کاتێك باوەڕمان بەوە هێنا کە گەلانی جیهان هەموو وەك یەك ئازادن، واتە مافی ئازادی‌یان هەیە، ئەوسا هیچ گەلێك و هیچ کەسێك نامێنێ کە مافی ئەوەی هەبێ دەست بخاتە جۆری ژیان و چارەنووسی گەلێکی دی‌یەوە. مەبەستیشمان لە دروشمی بڕیاری چارەنووس کە هەڵمان گرتووە؛ ئەم **"ئازادی"**یەیە کە باسمان کردو بە کوردی ڕەوا دەبینین و دەمانەوێ کە کورد خۆی بڵێ چۆن دەیەوێ بژی. جا ئەوەی دان بەم مافەدا نەنێ، مانای وایە دەڵێ **"کورد مافی ئەوەی نی‌یە ئەوەندەی گەلێکی دی (ئازاد) بێ"** واتە دەڵێ **"کورد کەمترە لە گەلەکانی دی کە ئازادن"**. جا لەبەر ئەوەی ئێمە باوەڕمان بەوەیە مرۆڤ، هەموو، لەلایەن یەك هێنەرە بوو (خالق)ەوە دروستکراون کە خاوەنی ئەم گەردوونەیە، ئەوەی بەم مافی ئازادی‌و وەك یەکیی مرۆڤە باوەڕی نەبێ؛ دیارە دژی سروشتی گەردوون و دوژمنی مرۆڤایەتی‌یە. دیسان ئەوەش دەبێ بڵێین کە ئێمە **"ئازادی"** بە جۆرێك تێ دەگەین کە **"ئازادی"** لە **"دژی ئازادی"** بەکار نەهێنرێ. بۆ وێنە: بەلای ئێمەوە هیچ **"مرۆڤێك"** و **"کۆمەڵێك"** و **"گەلێك"** لەوەدا **"ئازاد"** نی‌یە کە **"رێی ئازادی"** لە **"مرۆڤێك"** یان **"کۆمەڵێك"** یان **"گەلێك"**ی دیکە بگرێ، هەروەها لەوەدا **"ئازاد"** نی‌یە کە لە **"دژی ئازادیی خۆی"** کاربکات. بۆ وێنە: ئەگەر کابرایەکت لەسەر جاددە دی و خەریك بوو خۆی

بکوژێ تۆ دەستبەجێ پەلاماری دەدەیت و دەستی دەگریت و نایەڵیت خۆی بکوژێ. بۆچی؟ چۆنکە ئەو کەسە دەیەوێ "**ئازادیی خـۆی**" بەکاربهێنێ لە دژی ژیانی خۆی کە دەبێ "ئازاد" بێ و لە زۆر لێ کردن بپارێزرێ و ئازادانە بمێنێ. هەر لەبەر ئەوەشە کە هێندێك لە ئاینە ئاسمانی‌یەکان و قانوونە دانراوەکان سزایان داناوە بۆ ئەوانەی خۆیان دەکوژن. ئەو کەسەی کە خۆشی دەکوژێ؛ دیارە هۆشی بە خۆی نی‌یە، یان مێشکی تەواو نی‌یە.

خۆ ئەگەر ئەو کەسە بەڵگەکەی ئەوە بێ بڵێ "**ئـازادم، چـی لـە خـۆم دەکـەم دەیکـەم**"، ئەوا بەڵگەکەی نا بەجێ‌یە و لێی وەرناگیرێ. جا ئەگەر هاتوو "**گەل**"ێکیش لە هەڵخڵەتاویی خۆیەوە، یان لەسەر لێ تێکچوونەوە، یان لەبەر هەر هۆیەکی دی؛ چوو لە "**دژی ئازادیی خۆی**" بڕیارێکی‌دا؛ ئەوا ئێمە لەگەڵ ئەو بڕیارەدانین. چۆنکە ئێمە بڕیارێك بە ڕەواو هەق دەزانین کە لە ناخی هۆش و بیرکردنەوە و لێکدانەوەیەکی ئازادانەوە هاتبێ؛ واتە لە "**دژی ئازادی**" نەبێ. ئەو کەسەی کە بڕیاری کوشتنی خۆی دەداو ئێمە دژی بڕیارەکەی دەوەستین؛ لەبەر ئەوەیە چۆنکە بڕیارەکەی لە هۆشەوە نەهاتووە، هەر بەم پێ‌یەش دژی هەموو بڕیارێك دەوەستین کە کۆمەڵێك یان گەلێك لە دژی ئازادیی خۆی بیدا. چۆنکە هەر بڕیارێك کە لە "**دژی ئـازادیی خـۆ**" بدرێ؛ دیارە لە هۆش و بیرکردنەوەی تەندروستانەوە نەهاتووە و نایەت. جا ئەگەر گەلەکەی ئێمەش هاتو ڕۆژێك لە ڕۆژان بە دیلی ڕازی بوو؛ واتە "**لە دژی ئازادیی خـۆی**" دەنگی‌دا؛ ئەوا ئێمە بەو بڕیارە ڕازی نابین و لە دژی دەوەستین؛ چۆنکە بڕیاری وا لە هۆش و بیرکردنەوەی تەندروستانەوە نایەت. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئێمە بە هیچ جۆرە حکوومەتێکی فاشیستی و دیکتاتۆری و ملهوڕی ڕازی نابین و لە دژی دەوەستین، تەنانەت ئەگەر بێتو زۆربەی زۆری گەل یان هەموو گەلیش دەنگ بدا بۆی. چۆنکە دەنگدان بۆ حکوومەتی لەو جۆرە؛ دەنگدانە لە "**دژی ئـازادی**" و دەنگدانیش لە دژی ئازادی لە هۆش و بیری تەندروستانە و تێگەیشتن و هەستی مرۆڤایەتی‌یەوە نەهاتووە و نایەت و بە هەڵەچوونە و ئێمەش پشتی هەڵە ناگرین؛ با هەموو جیهانیش لەگەڵی بێ.

هەروەها ئەگەر لێمان بپرسن و بڵێن: "**سۆسیالیزمی زانستانەتان لا باشە یان سۆسیالیزمی خەیاڵی؟**". ئێمە دەڵێین: بیرو شێوەی زانستانە بەلای ئێمەوە ئەوەیە؛ بابەتانە بێ؛ واتە لە بابەتەکە خۆیەوە وەرگیرابێ. کە کیمیاگەرێك دێ و باسی پارچە مسێك دەکا؛ دەبێ لە پارچە مسەکە خۆیەوە دەست پێ بکات و

بیکێشیٚ و بیشکێنیٚ و بیتوێنێتەوە و..هتد. کە زانایەکی زانستی کۆمەڵاتیش دیٚ و باسی کۆمەڵگەیەکی تایبەتی دەکات؛ دەبیٚ لەو کۆمەڵگەیە خۆیەوە دەست پیٚ بکات و لەو کۆمەڵگەیە خۆی بکۆڵێتەوە و هوردبێتەوە؛ ئەوجا دەتوانیٚ کۆمەڵگە بگۆڕیٚ. خۆ ئەگەر هاتو لە کۆمەڵگەکەی خۆیەوە دەستی پیٚ کرد و واقیعی کۆمەڵگەکەی خۆی بە هەموو رابوردوویەکی مێژوویی‌یەوە نەهێنایە بەرچاو و لەو واقیعەوە قانوونەکانی کۆمەڵایەتی بۆ ئەو کۆمەڵگەیە دەرنەهێنا و چوو یەکسەر و پێشەکی و لەبەر بووره پەنای بردە بەر قانوون و نەرێتی واقیعی کۆمەڵگەیکی دی و ویستی بیچەسپێنیٚ بەسەر کۆمەڵکەی خۆیدا، دیارە ئەو کەسە وەك ئەو کیمیاگەرە وایە کە ئەو ئاسنەی باسی دەکات؛ نەیخستبێتە تەرازوو و نەیکێشابیٚ و نەیتواندبێتەوە و هیچ جۆرە تاقیکردنەوەیەکی لەسەر نەکردبیٚ؛ بەڵکو چەند ئەنجام و سەرنجێك کە لە پارچە ئاسنێکی دی‌یەوە دەستی کەوتبیٚ، بهێنیٚ و کوتومت بەسەر پارچە ئاسنە نەکێشراو و نەتواوەکەی خۆی دابسەپێنیٚ. جا چۆن بەو کەسە ناگوتریٚ "**کیمیاگەر**" و "**زانا**"، بەڵکو "**سەرلیٚشێواو**" و "**ریٚ هەڵەکردوو**"؛ ئەوا بەو کەسەش کە کۆمەڵگەیەك بە تەرازوو و پێوانەی کۆمەڵگەیەکی دیکە دەپێویٚ و پێی دەڵیٚ "**زانستانە**"؛ هەر نەك ناگوتریٚ "زانا"، بەڵکو پێی دەگوتریٚ "**ریٚ بە خەڵك هەڵەکەر**" و "**سەر لیٚ شێوێن**" و "**قومار باز**".

دە ئێمە رێی بیرکردنەوە و بۆچوون و لێکۆڵینەوەمان لە کۆمەڵگەی کورد؛ ریٚیەکی زانستانەیە؛ چۆنکە لە کۆمەڵگەی کورد خۆیەوە دەست پیٚ دەکەین و ئەو ئەنجامانەی لە پاش شی کردنەوە و هورد کردنەوەی واقیعی کۆمەڵگەکەمان دەستمان کەوتووە، زانستانەیە؛ لەبەر ئەوە ئەو چارەسەرانەی دای دەنێین بۆ گۆڕینی باری کۆمەڵگە پڕ بەپێستی پێویستی‌یەکان و مەرجەکانی گۆڕینێتی. بەڵام ئەوانەی کە لە واقیعی کۆمەڵگەی خۆیان لایان داوە و چوون ئەو بیرانەی لە هوردکردنەوەی واقیع و زرووفی کۆمەڵگەیەکی دی‌یەوە پەیدا بوون، دەهێنن و دەیانەویٚ بە زۆری زۆردارەکی بە بالای گەلەکەمان بیگرن؛ ئەوانە خەیاڵین. چۆنکە؛ با هیچ دوور نەڕۆین؛ رانکوچۆخەیەك کە بۆ تۆ دووڕابیٚ، هیچ مەرج نی‌یە بە بەریەکێکی دی بکا. خۆ ئەگەر کردی، ئەوا ئەمە رێکەوتە و هیچی دی و نابێتە یاساو دەستوور و نەرێتێکی گشتی.

ئەمە واو بێجگە لەمەش ئێمە بەو پرسیارە رازی نابین کە بڵێین **"سۆسیالیزم باشە یان نە؟"** چۆنکە ئەم پرسیارە بەلای ئێمەوە تەواو نییە. راستییەکەی ئەوەی لە سەرەوە باسمان کرد پرسیاری **"سۆسیالیزم چییە"** و **"چ جۆرە سۆسیالیزمێك؟"** دێنێتە گۆڕێ. جا وەك چۆن ناتوانیت بپرسیت: **"جلوبەرگ و پێڵاو باشە یان نا؟"** بەڵکو دەبێ بڵێیت: **"چ جۆرە پێڵاوێك؟"**. چۆنکە ئەگەر جلو بەرگ و پێڵاوێك بە بەرت نەکات؛ سووتێکی نییە بۆ تۆ. خۆ ئەگەر هاتو پێڵاوێك پێتی گوشی و بریندارى کرد؛ ئەوا بێ پێڵاوی چێترە. هەر لەبەر ئەمەشە ئەگەر سۆسیالیزمێکیش پڕ بە پێستی کۆمەڵگەکەت نەبوو و لە واقیعی کۆمەڵگەکەی خۆت و پێویستییەکانییەوە سەری هەڵ نەدابوو و قۆپێی ئەم و ئەو بوو و لەم لاو لەو لا خواسترابوو، ئەوا ئەو سۆسیالیزمە نەبوونی چێترە، وەك پێڵاوە تەنگەکە، جا لەبەر ئەوەی سۆسیالیزمەکەی ئێمە لەسەر بنچینەی واقیعی کۆمەڵگەکەمان دامەزراوە و لە تاقیکردنەوەی ژیانی زەحمەتکێشانی ئەو گەلانە کەڵکی وەرگرتووە کە لە هێندێ لایەنەوە لە هی کورد دەچێ و ئازادیی مرۆڤ و مرۆڤایەتی کردووە بە ئامانجی؛ ئەوا نێوەرۆك و شێوەیەکی تایبەتی بۆ خۆی گرتووە و هەر لەبەر ئەوەشە ئێمە بە سۆسیالیزمەکەی خۆمان دەڵێین **"سۆسیالیزمی قوتابخانەی کوردی"**.

ئەمانەی سەرەوە هەموو وێنە بوون بۆ سیاسەتی ئێمە کە لە بیروباوەڕێکەوە هەڵدەقوڵێ بابەتانەو بنچینەیییە و بە هیچ جۆرێك سەرنجێکی سەرپێیی و کارێکی رووالەت و قۆپێی ئەم بیر و ئەو بیر نییە. هەر لەبەر ئەوەشە ئێمە هەر بە دوای چارەسەری بنچینەییدا دەگەڕێین و بە پینەو پەڕۆ و چارەسەری رووەکی نابابەتانە و کاتی رازی نابین. بەڵام ئێستە دەبێ بپرسین بزانین ئایە ئەم سیاسەتە لە مەیدانی کردەوەدا چۆنە؟ بۆ وەرامی ئەمە دەبێ دوو شت رۆن بکەینەوە؛ یەکەمیان **"ستراتیژ"** و دووەمیان **"تاکتیك"**.

هەموو بزوتنەوەیەك بریتییە لە کردەوەیەك و هەموو کردەوەیەکیش دەبێ لە بیرێکەوە هەڵقولابێ. جا ئێدی ئەو کردەوەیە کورت خایەن بێ یان درێژخایەن بێ؛ وەك یەکە و لە هەردوو بارەکەدا دەبێ لە بنەڕەتدا لە بیرێکەوە پەیدا بووبێ؛ سا ئێدی بیرەکە قووڵ و فەیلەسووفانە بێ، یان سەرزاری و ساویلکانە و زاڕۆیانە بێ؛ ئەوە هەریەکە. لەبەر ئەوە هەموو کردەوەیەکی سیاسی کە دەربڕینی بزووتنەوەیەکی سیاسییە؛ دەبێ لە بنەڕەتدا لە بیرێکی سیاسییەوە سەری هەڵدا بێ کە بەو بیرە هێندێ جار دەگوترێ بیروباوەڕ یان

__فەلسەفە__ یان __ئیدیۆلۆژی__. وەزیفەی بیروباوەڕی سیاسیش ئەوەیە کە بزووتنەوەیەکی سیاسی بهێنێتە بوون بۆ هێنانە دی ئامانجەکانی. جا لێرەدا ئەگەر بیروباوەڕ بە "**کەرەسە**" (مادة) دابنێین؛ دەبێ "**بزووتنەوە**" بەو "وزە"یە (طاقة) دابنێین کە لە ماددەکەوە پەیدا دەبێ. "**بزووتنەوە**" واتە "وزە" لە کاتی کەوتنەکاردا دەبێ بەرەو ئامانجێك بکەوێتە ڕێ کە بەو ئامانجە دەبێژرێ "**ستراتیژ**". جا بۆ ئەوەی "**بزووتنەوە**" بگاتە ئامانجی خۆی، واتە بگاتە "**ستراتیژ**"، دەبێ بکەوێتە ڕێ. ئەگەرنا ئەگەر بوەستێ پێی ناگوترێ "**بزووتنەوە**". دیارە ئەو "ڕێ" یەی "**بزووتنەوە**" بەرەو "**ئامانج**" دەیگرێتە بەر؛ هەموو جارێك لەسەر هێلێکی تایبەتی نابێ و هێندێ جار دێتە گۆڕان. بۆ وێنە ئەگەر ویستت لەبارەگەی (س)ەوە بچیت بۆ بارەگەی (ن) (تەماشای ئێسکی تەنشیت بکە)، هەموو جارێ هەر بەسەر هێڵی (س ن) دا کە کورتترین ڕێیە ناڕۆیت؛ بەڵکو جاری وا هەیە ناچار دەبیت کە ڕێ بگۆڕیت و بە پنتی (نقطة) (ل)دا بچیتە (ن) یان بە پنتی (م) و (ت) و (ج)دا خۆت بگەینیتە (ن). ئەم ڕێیانەی دەیانگریت و ئەو پنتانەی پێیاندا تێ دەپەڕیت بۆ گەیشتنە (ن)؛ لە سیاسەتدا پێیان دەگوترێ "**تاکتیك**". جا کە تۆ لە (س)ەوە دەچیت بۆ (ن): لەسەر ڕێی (س ن) بڕۆیت و بگەیتە (ن)؛ واتە کورترین ڕێ بگریت؛ یان ناچار ببی لەڕێی (س ل)ەوە بگەیتە (ن) ئەوە هەریەکە؛ چۆنکە ئامانج هەر (ن)ە و بەمە تەنیا **تاکتیکت** گۆڕاوە؛ لە کاتێکدا "**ستراتیژ**"ت هەروەك خۆی ماوە. لەم دۆخەدا **تاکتیك** هەرچەند گۆڕاوە؛ بەڵام لە هەر سێ بارەکەدا هەر لە خزمەتی "**ستراتیژ**" دایە، ئەوەندە هەیە جۆری بەکارهێنانی "**تاکتیك**" و کاتی گەیشتنە "**ستراتیژ**"ت جیاوازن لەگەڵ یەك. لە هەمان کاتدا "**ئامانج**" لە بەکارهێنان و گۆڕینی "**تاکتیك**" هەروەك خۆی ماوە. لەم دۆخەدا تۆ بە هیچ جۆرێك لە "**ستراتیژ**"ی خۆت لات نەداوە، هەرچەندە لە هێندێ باردا درەنگت بەسەر چووە. درەنگ بەسەرچوون ئەگەر لە تەمەڵی و خوازەلۆکی، یان بڕو بیانووی بێ جێ، یان نەزانی نەبێ؛ بەڵکو لەبەر مەترسیی ڕێ و بان و خۆپاراستن بێ؛ شتێکی ڕاست و دروست و پێویستە. __مرۆڤی__

خاوەن باوەڕی ئامانج لەبەر چاوی دڵ بینا؛ لەسەر خۆ و بە ئارام و هەناسە درێژ و بەتاقەتە.

ئەوانەی کورت بین و هەڵەشە و کەم چیکڵدانە و بێ ئارامن؛ با ژیرەکەیش بن؛ زوو دەکەونە جرتوفرت و ئامانج لەبەر چاویان ون دەبێ و پێیان هەڵ دەخلیسکێ و دەبنە هۆی لە نێوچوونی خۆیان. کەواتە دواکەوتن لە گەیشتنە ئامانج لەبەر خاتری تاکتیك؛ کارێکی بەجێ و ڕەوایە. ئەمە تا ئێرە وایە. بەڵام ئەگەر هاتوو تۆ لە (س)ەوە کەوتیتە ڕێ و جارێ نەگەیشتیتە (ن) بەڵکو گەیشتیتە پنتی (ی) کەوا لەسەر ڕێی (س ن)ە و ئەوجا لات دا بۆ پنتی (پ) و لە (پ)دا وەستایتەوەو بەجارێ مایتەوە، یان لەوێوە چوویتە جێیەکی دی کە (ن) نە بوو و لەوێدا بەجارێ مایتەوە، ئەوا بەوە "ستراتیژ"ت گۆڕی، و ئەو دەمەش تاکتیك؛ با زۆریش نەگۆڕابێ، یان لەم بەرو ئەوبەردا کاتێکی زۆری پێ نەچووبێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە خزمەتی "ستراتیژ"دا نەماوە و تۆش لەم دۆخەدا لە "ستراتیژ"ی خۆت لات داوە.

ڕاستی‌یەکەی ئەم وێنەیەی لەسەرە بە ماتماتیك پێشان درا؛ نەك هەر لە ڕێ ڕۆیشتن و جۆگرافیادا ڕاستە؛ بەڵکو لە زانستی کۆمەڵگە و سیاسەتیشدا هەروایە. تا تاکتیك لە خزمەتی ستراتیژدا بێ، هەر چەندێکیش بگۆڕێ، یان کاتێکی کەم یان زۆری پێ بوێ بۆ گەیشتنە ئامانج؛ ئەوا تۆ لە بیروباوەڕ لات نەداوە و هەلپەرستیت نەنواندووە. خۆ کە تاکتیك لە خزمەتی ستراتیژدا نەما؛ ئەوا تۆ لە بیروباوەڕ لات داوە و بوویتە هەلپەرست، یان بارپەرست، یان کوڕی ڕۆژ. بۆ نموونە و پتر ئاشکراکردنی ئەم قسەیە با بڵێین ئەم ئێسکەی تەنیشت کە بازنەیەك (دائرة) پێشان دەدا؛ بیروباوڕێکی سیاسی دەنوێنێ. (ن) بریتی‌یە لە "ستراتیژ"ی بیروباوەڕەکەو وا لە کرۆکی (مرکز)ی بازنەکەدایە.

پنتی (ل) و (م)و (س)و (ت)و (پ)و (ڤ)و (چ) تاکتیکی جۆرجۆر دەنوێنن کە هەموویان وان لەسەر کەوە (محیط)ی بازنەکە. کەوەی بازنەکە لێرەدا ڕێڕوو (مسار)ی بزووتنەوە سیاسی‌یەکە دەنوێنێ.

لێرەدا دەبینیت کە دووریی تاکتیك لە هەموو بارێکدا، لە ستراتیژەوە هەر وەك یەکە و ئەوەندەی نێوە ئەشکێڵ (نصف قطر)ێکە. بۆ وێنە: دووریی

تاکتیکی (ل) له ستراتیژی (ن)ەوه هەروەك دووریی تاکتیکی (م)ە لە ستراتیژی (ن)ەوه و هەر وەك دووریی تاکتیکی (س)ە لە ستراتیژی (ن)ەوه و..هتد، ئەو دووریەش لێرەدا بەنێوه ئەشکێڵی بازنەکه دەدرێته قەڵەم؛ واته: ل ن=م ن=س ن=ت ن=پ ن=ڤ ن=ج ن. جا هەتا شوێنی تاکتیکی سیاسی له کاتی بزووتنەوەی سیاسی‌دا بەرەو ئامانج؛ لەسەر کەوەی بازنەکه بمێنی؛ با جی‌یەکەشی بگۆڕێ، ئەوا هەر بە دەوری کرۆکی (مرکز) بازنەکەدا دەسووڕێتەوه که ستراتیژی بزووتنەوەکەیه. خۆ ئەگەر شوێنی تاکتیك لەسەر کەوەی بازنەکه لاچوو؛ ئەوا بە دەوری کرۆکی بازنەکەدا ناسووڕێتەوه و لە خزمەتی ستراتیژدا نامێنی. هەر لەبەر ئەمەشه که بە هەیڤ و زەوی و چەند ئەستێرەیەك دەگوترێ **"کۆمەڵەی خۆر"** چۆنکه هەموو بە دەوری خۆردا دەسووڕێنەوه، خۆ ئەگەر بێتو بە دەوری خۆردا نەسووڕێنەوه؛ ئەوا دیاره کەوتوونەته نێوچەی راکێشانی خۆرێکی دی، یان تەنێکی ئاسمانیی دی و پی‌یان ناگوترێ **"کۆمەڵەی خۆر"**.

جا ئێسته بۆ ئەوەی بزانین کام بیروباوەڕی سیاسی‌یه که دەتوانێ تاکتیکی بزووتنەوەکەی لە خزمەتی ستراتیژی‌دا بهێڵێتەوه و کام بیروباوەڕی سیاسی‌یەکه ناتوانێ تا بزووتنەوەکه لە خزمەتی ستراتیژدا بهێڵێتەوه، قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم دوو جۆره بزووتنەوه لەیەك جیا دەکاتەوه:

١- **بزووتنەوەی رەسەن.**

٢- **بزووتنەوەی نارەسەن.**

١- **بزووتنەوەی رەسەن:** بزووتنەوەی رەسەن ئەو بزووتنەوەیه که بابەتانه بێ؛ واته له بیروباوەڕێکی بابەتانەوه هەڵ قوڵابێ. بە کورتی دەبێ کەرەسەی ئەو بیروباوەڕه کۆمەڵگەکه خۆی بێ. بزووتنەوەی نارەسەنیش ئەوەیه که بابەتانه نەبێ، واته له بیروباوەڕێکی نابابەتانەوه هەڵقوڵابێ؛ مانای کەرەسەی ئەو بیروباوەڕه کۆمەڵگه خۆی نەبێ؛ بەڵکو کۆمەڵگەیەکی دیکه بێ. بیروباوەڕی رەسەن چۆنکه لە کەرەسەکه خۆیەوه وەرگیراوه؛ دووری‌یەکانی (ابعاد) بیروباوەڕەکه پڕ بە پێستی دووریەکانی کەرەسەکەیه. هەر لەبەر ئەوەشه که دەتوانێ بزووتنەوەیەکی رەسەن بهێنێته کایەوه. بیروباوەڕی نارەسەنیش چۆنکه له کەرەسەکه خۆیەوه هەڵ نەقوڵاوه؛ دیاره دووری‌یەکانی پڕ بە پێستی دووری‌یەکانی کەرەسەکه نی‌یه و هەر لەبەر ئەوەشه که ناتوانێ بزووتنەوەیەکی رەسەن بهێنێته کایەوه.

لێرەدا ئەگەر کۆمەڵگەی ئادەمزاد بە کەرەسەی بیروباوەڕی سیاسی دابنێین؛ دەبێ بزانین کە کۆمەڵگەی ئادەمزاد لە هەموو کاتێك و لە هەموو جێیەکدا و لە ژێر هەموو بارو دۆخێکدا وەك یەك نین و لە یەك ناچن و دوورییە ژیارییەکانیان (الابعاد الحیاتیة) لە هی یەکدی جیاوازن. لەبەر ئەوە تۆ هەر کۆمەڵگەیەکی ئادەمزاد بگریت؛ دەبینیت لە جۆرە "**کەرەسە**"یەك پێك هاتووەکە یان لە گەلێك، یان لە هێندێك رووەوە، لە هی کۆمەڵگەکانی دی ناچێ. هەر بەم جۆرە، هەریەکەیان؛ بزووتنەوەیەکی سیاسیی، زۆر یان کەم جیاواز لەوی دی دێنێتە کایەوە. لەبەر ئەوە ئەگەر هاتو ویستت لە کۆمەڵگەیەکی دیاری کراودا بزووتنەوەیەکی رەسەن بهێنیتە کایەوە؛ دەبێ لە پێشەوە لە واقیعی ژیاریی (الواقع الحیاتي) ئەو کۆمەڵگەیەوە دەست پێ بکەیت و درێژی و پانی و قووڵی و سەردەمی ئەو واقیعە بخەیتە بەرچاوت. خۆ ئەگەر ئەمەت نەخستە بەر چاوت؛ ئەوا بزووتنەوەکەت هەر لەسەرەتاوە ناڕەسەن دەردەچێ.

جا ئەمە مانای وانییە کە خاوەنانی ئەم بیرە دەبێژن مرۆڤ بە هیچ جۆرێك نابێ لە سنووری کۆمەڵگەی خۆی دەربچێ و نابێ بە هیچ جۆرێك چاوێك بگێڕێت بە کۆمەڵگەکانی دیکەی ئادەمزاددا. نەخێر. وایان نەگوتووە و واش ناڵێن.

بەڵکو دەبێژن کە کۆمەڵگە جۆرجۆرەکانی ئادەمزاد، هێندێ سروشتی وەك یەکیان تێدایە و بێجگە لەوەش بەسەرهات و تاقیکردنەوەکانیان لە رێی بەراوردکارییەوە بۆ یەکدی بە سووتن. لەبەر ئەوە دەبێ ئەوە بڵێین کە سووت وەرگرتن لە تاقیکردنەوە و زادەی بیری کۆمەڵگەیەکی دی، لەگەڵ ئەو راستییەدا کە بریتییە لە لە "**واقیعی خۆ دەرچوون**" و دوورکەوتنەوە لە ماکی کۆمەڵگە، واتە ناڕەسەن کردنی بیروباوەڕ و بزووتنەوە، دوو شتن لە یەکدی زۆر جیاوازن. راستییەکەی ئێمە لێرەدا ناچارین کە باسی یەکێك لەو کوێرەوەرییە هەرە گەورانە بکەین کە تووشی کۆمەڵگەی ئادەمزاد بووە، کە ئەوەش چاو لێکەری؛ واتە دوواکەوتنی مۆدەیە. ئەوەش بە وێنەیەکی کوێرانەو بەتایبەتی لە نێو ئەوانەدا باوە کە تاقەتی بیرکردنەوە و شی کردنەوە و هوردبوونەوە و لێکۆڵینەوە و بەراوردکردنیان نییە و لام سەرلایی دێنە دەست. جا ئەم چاو لێکەری و دوواکەوتنی مۆدەیە وەنەبێ هەر لە ژیانی کۆنسوومی، واتە لە لەبەرکردنی جلوبەرگێکی تایبەتی، یان کێشانی جگەرەیەکی تایبەتی، یان نۆشینی خواردنەوەیەکی تایبەتی و کڕینی جۆرە پایسکل یان ئۆتۆمۆبێل یان

تەلەفزیۆنێکی تایبەتی‌دا بێ، نەخێر، بەڵکو لە سیاسەت و بزووتنەوەی سیاسیشدا هەر وایەو "مۆدە" دەورێکی گرنگ دەگێرێ. جا ئەم سروشتی چاولێکەری‌یە و "**مۆدە پەرستی**"یە؛ بەتایبەتی لە نێو چینی ورده بۆرژوازی‌دا، زۆر بە ئاووتاون. ورده بۆرژوا، بە تایبەتی ورده بۆرژوای ئەو وڵاتانەی ژێردەستە و داگیرکراون، یان نیوە ژێردەستە و پێبەندی ئیمپریالیزمی بێگانەن و لە پیشەسازی و تەکنیکدا دواکەوتوون، وەك نەدی و بدی وانە؛ کاتێك دەچنە نێو گەلانی وڵاتە داگیرکەرەکانەوە، یان دەستیان دەگاتە وڵاتە پیشەسازی‌یە سەرمایەدارەکانی ئەورووپا؛ هەست بە ناتەواوی و خۆ کەم بینینێکی یەکجار زۆر دەکەن و هەوڵی چاولێکردنێکی کوێرانەیان دەدەن. جا ئەم چاولێکەری‌یە هەر لە جلو بەرگ و شێوەی خواردن و خواردنەوەو ماڵ رازاندنەوە و هەڵسوکەوتدا نی‌یە؛ بەڵکو هەوڵ دەدەن لە جۆری بیرکردنەوەشدا هەر خۆیان لەوان بچوێنن. دیارە کە بیانەوێ مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵگەکەی خۆیان بکەن؛ دێن بەرهەمی بیرو واقیعی ژیاری و سیستەمی ژیانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگەکەی خۆیان بە تەرازوو و پێوانەی کۆمەڵگەیەکی دی دەکێشن و دەپێون، لەبەر ئەوە ئەو بزووتنەوانەی کە لەم جۆرە بیرە نارەسەنانەوە دێنە دەرەوە هەر نارەسەن دەبن. ئەو دەمەش تاکتیك لە خزمەتی "**ستراتیژ**"دا نابێ؛ بەڵکو "**ستراتیژ**" لە خزمەتی "**تاکتیکدا**" دەبێ. چۆنکە "**ستراتیژ**" هەردەمە بە پێیدەسکەوتی کاتی و بەرژەوەندیی هەلپەرستانەی ئەوانەی خەریکی سیاسیەتن دێتە گۆرین. ئەگەر تەماشایەکی پرۆگرام و پێرۆی گەلێك لە حیزبە کوردی‌یەکان و رۆژهەڵاتی‌یەکان بکەیت؛ دەبینیت لە هەردەورێکدا جۆرێك بووە و جیاوازیی نێوان دەورێك و دەورێکی دی جیاوازیی ئەرزو ئاسمان بووە لەیەکەوە. ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی ئەمانە لە ماوەیەکی تایبەتی‌دا باوەڕیان بەسەرەتایەکی ئیدیۆلۆژیی تایبەتی بووە، و لە ماوەیەکی تایبەتیی دی‌دا باوەڕیان پێی نەماوە. نەخێر، بیروباوەڕ خۆی لە خۆی‌دا نارەسەن بووە و لەگەڵ کۆمەڵگە نەگونجاوە، لەبەر ئەوە، هەر دەمە بە پێی کات و رۆژ و هەلومەرج و دەسکەوتە کاتی‌یەکان و پێویستی‌یە رووالەتەکانی ئەو سەردەمە و بەرژەوەندیی تایبەتیی سەرکردایەتیی ئەو حیزبانە؛ پرۆگرام و پێرۆیەکی تازە سەپێندراوە بەسەر ئەندامان و لایەنگیراندا و ئەمەش لە بنەڕەتدا هەمووی (مساومە) بووە لەگەڵ بێگانەی داگیرکەر یان زۆرداری بەدەسەڵاتدا، لەسەر حسێبی رەشوڕووتی بەشخوراوی هەڵخەڵەتێنراوی لە گوێی گادا نوستوو.

ئێستە دێینە سەر پرسیارەکەی پێشوومان و درێژە دەدەین پێی و دەڵێین: ئایە بیرو باوەڕێکی ڕەسەن کە سیاسەتێکی بنچینەگری ڕەسەن دێنێتە بوون، هەڵوێستی بەرامبەر بە ڕێکەوتن لەگەڵ بزووتنەوەکانی دا چی‌یە؟

بە پێی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم سیاسەتی ڕەسەن ئەوە نی‌یە کە مرۆڤ بە هیچ جۆرێك بار و دۆخی خۆو نێوخۆ و دەرەوەو هێزەکانی دی لێك نەداتەوە و، هەموو کاتێك بە هیشکوبرنگی ملی ڕێ بگرێ و ئەگەر هاتو ڕێ پڕ لە مەترسیش بوو؛ ئەوا ئەو هەر ملی پێوە بنێ و بە هەموو جۆرێك هەر لە (س)ەوە بچێ بۆ (ن). نەخێر. وانی‌یە. لەسیاسەتدا نەرمونیانی و دان بەخۆدا گرتن و ئارام گرتن و چاوەڕوان کردن زۆر پێویستە. بۆ وێنە کە تۆ لە (س)ەوە بتەوێ بچیت بۆ (ن)؛ پێویست ناکا هەموو کاتێك هەر یەکسەر و بە کورتترین ڕێ‌دا؛ واتە بە (س ن)دا بگەیتە (ن)؛ ئەگەر هاتو مەترسیی ڕێ زۆر گەورەبوو؛ بەڵکو دەتوانیت لە (س–م–ت–ج)ەوە بچیتە (ن) و لە هەر پنتێکدا لەسەر ئەو هێڵە ماوەیەك وچان بگریت و بمێنیتەوە، بەڵام بە مەرجێ ئامانجت هەر (ن) بێ، نەك جێ‌یەکی دی بێ. ئەمەش بە مەرجێکە کە تۆ بەڕاستی دەسەڵاتی یەکسەر چوونە (ن)ت نەبێ و لە هەموو کاتێکدا ئامانجت هەر چوونە (ن) بێ. ئەگەر وابوو، ئەوا هیچ جۆرە لادان و هەلپەرستی‌یەك ڕووی نەداوە لێت، و ئەم کارەت تاکتیکێکی ڕەوایە؛ چۆنکە لە خزمەتی **"ستراتیژ"** دایە.

جا لەم ڕێ‌یەدا کە هێندێ جار دووروودرێژ دەبێتەوە وەك ڕێی (س–م–ت–ج)؛ هی وات تووش دەبن کە ناچن بۆ (ن)، بەڵکو تا (م) یان (ت) دەچن و لە (م) و (ت) وە لە تۆ جیادەبنەوە و دەچن بۆ (ز) یان (ش). تۆ دەتوانیت لەگەڵ ئەمانە بکەویتە ڕێ و پێکەوە هاوکاری بکەن و خۆتان لە چەتە و جەردە و ڕێگر بپارێزن. بەڵام دەبێ ئەوەت لە بیر نەچێ کە ئەوانە نایانەوێ بگەنە (ن)؛ چۆنکە ئامانجیان (ن) نی‌یە، لەبەر ئەوە دوور نی‌یە کە گەیشتنە ئامانجی خۆیان، لە تۆ هەڵبگەڕێنەوە و بچنە سەر لایەکی دی، یان لە پڕ بەجێت بهێڵن بۆ ڕێگرو جەردەی سەرەڕێ. لەبەر ئەوە دەبێ تۆ هەر لە پێشەوە حسێبی ئەمانەت کردبێ. چۆنکە ئەوانەی بوونەتە هاوڕێی سەفەرەکەت، هەرچەندە لە تەنیشتەوە دەڕۆن؛ بەڵام دەبێ ئەوە بزانیت کە ئەوانە بۆیە لەگەڵ تۆ نین کە لە ڕێی خودیێ‌دا تۆ بەهێز بکەن، ئەوانەش دەیانەوێ بگەنە ئامانجی خۆیان، بەڵام شتێکە بەڕێکەوت جارێ لەسەر ئەو ڕێ‌یەن کە تۆ لەسەری دەڕۆیت و دەیانەوێ مەترسیی ڕێ و بان لە خۆیان دوور بخەنەوە بە پشتی تۆ. بە کورتی: ئەمانە

هاوڕێتن، هاوبیرت نین. بەڵام لێرەدا دەبێ تۆش دوو جۆرە هاوڕێ لە یەك جیا بکەیتەوە. ئەوی بەڕاستی وەك تۆ ئیدیالێکی سیاسی هەیە، با ئیدیالەکەشی لە هی تۆ نەچێ، و ئەوی هیچ ئیدیالی سیاسی نی یە؛ بەڵکو دەیەوێ خزمەتی خۆی بکا. هەرچی تاقمی دوومە، مرۆڤ دەبێ هەمیشە لێی بەگومان بێ و هێندێ جاری وا هەیە باشتر ئەوەیە مرۆڤ بە تەنیا بکەوێتە ڕێ وەك لەوەی لە یەك کارواندا لەگەڵ هەلپەرست و کوڕی ڕۆژ و خۆبژێن بێت. هەروەها چوونە بەرەی نیشتمانی یەوە لەگەڵ حیزب و کۆمەڵە سیاسی یە جۆرجۆرەکاندا دەبێ لەسەر ئەم بنچینە بێ. جا ئەگەر هاتو لەگەڵ کۆمەڵێکی سیاسیی بەرهەلستکاردا چوویتە بەرەیەکەوە؛ دەبێ بەتەواوی بزانیت بۆچی ئەو کۆمەڵە سیاسی یە لەگەڵ حکوومەتی ئەو وڵاتەدا ناکۆکە. دەبێ بەتەواوی بزانیت ستراتیژی ئەو کۆمەڵەیە لە کوێیە و ئەو ڕێیانە چین کە پێیاندا دەڕوا بۆ گەیشتنە سرتاتیژەکەی، و بە تەواوی بزانیت چەند کیلۆمەتری ئەو ڕێیە لەگەڵ ڕێی تۆدا یەك دەگرنەوە و لە کوێدا دەوەستێ، یان لادەدا، یان بادەداتەوە!

بە کورتی ئەگەر تۆ-وەك کوردێك- ئامانجت؛ واتە "**ستراتیژ**"ت "**کوردستانێکی ئازاد**" و "**گەلێکی یەکسان**" بوو، واتە ویستت لە کوردستانێکی ئازاد دا مافی بڕیاری چارەنووسی کورد بەخۆی بێ. و لە کۆمەڵگەیەکی یەکساندا بژی کە چینایەتیی ئابووری و بیرۆکراتی تێدا نەمێنێ، دەبێ بزانیت کە ئەم دوو ستراتیژە مەزنە پێویستی یان بەو تاکتیکە ژیرانەیەیە کە هەمیشە لە خزمەتی ئەم دوو ستراتیژەدان. جا ئەگەر هاتوو توانیت لە هەلومەرجێکی تایبەتی دا، بابڵێین ئۆتۆنۆمی یەك بۆ بەشێکی کوردستان، یان چەند بەشێکی، یان هەمووی، وەربگریت، یان بە هێندێ مافی ناسیۆنال بگەیت؛ نابێ لە دژی بوەستیت و بیدەیتە دواوە، ئەگەر هاتوو ئەوە زیانی بە ستراتیژی دوورت؛ واتە "**کوردستانێکی ئازاد**" نەگەیاند. بە پێچەوانەوە؛ ئەوکاتە دەتوانیت پلەی ئۆتۆنۆمی وەك وێستگەیەك بەکار بهێنیت بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ کەوتنە ڕێ بەرەو ستراتیژی دوورت. بەڵام ئەگەر هاتو زانیت ئەو ئۆتۆنۆمی یە، یان ئەو جۆرە مافە ناسیۆناڵە؛ زیان دەگەیەنن بە ستراتیژی دوورت، دەبێ ئەو دەمە بێ یەکو دوو لە دژی بوەستیت. چۆنکە ئەو پلەیە ستراتیژی تۆ نی یە، وەك چۆن پنتی (م)و (ت)و (ج) ستراتیژی تۆ نین، بەڵکو لەسەرە ڕێی تۆدان بەرەو (ن). هەروەها ئۆتۆنۆمیش ستراتیژی تۆ نی یە، بەڵکو قۆناغێکە بەرەو ئامانجێك،

لەبەر ئەوە نابێ ڕێ بدەیت لات بدەن بەرەو ئامانجێکی دی کە ئامانجی تۆ نەبێ، تۆ هیچ کاتێك نابێ بە فشە مافێك ڕازی بیت کە مافی ڕاستەقینە پووچ بکاتەوە.

بۆ وێنە: ئەگەر حیزبێکی کوردیی هوردە بۆرژوازی گوتی **"کورد دەبێ مافە ناسیۆنالەکانی خۆی دەست بکەوێ"** و داوای ئۆتۆنۆمی بۆ بەشێکی کوردستان، یان هەموو کوردستان کرد، ئەوا هاوبیرانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم پشتی دەگرن، هەرچەندە ئامانجی وان ئۆتۆنۆمی نی‌یە. خۆ ئەگەر ئەو حیزبە گوتی؛ ئامانجی نەتەوەی کورد تەنێ ئۆتۆنۆمی‌یە و سوور بوو لەسەر ئەوە، یان هاتو بەربەرەکانێی مافی چارەنووسی نەتەوەی کوردی کرد؛ ئەوا هاوبیران پشتی داخوازی‌یەکەی ناگرن و کردەوەکانیشی بە خزمەتی ستراتیژی خۆیان نازانن. چۆنکە ستراتیژی هاوبیران لە پلەی ئۆتۆنۆمی‌دا ناوەستێ و هەر بەوە تەواو نابێ. هەروەها ئەگەر حیزبێکی کۆمۆنیست یان **"مارکسیست"** هات و ڕاستبێژانە باسی مافی کرێکاری کرد و لە دژی چەوساندنەوەو ڕووتاندنەوەی زەحمەتکێشان هاتە قسە؛ ئەوا هاوبیرانی سۆسیالیست پشتی دەگرن. تەنانەت ئەگەر گوتی فابریقەیەکی تایبەتی، یان کارگەیەکی تایبەتی دەبێ لە سەرمایەداران بسێنرێتەوە و بدرێتە دەست کرێکاران. هاوبیران لەوەشدا پشتی دەگرن، بەمەرجێ کرێکارەکان نەبنە سەرمایەداری تازە لە جێی سەرمایەدارە کۆنەکان. بەڵام ئەگەر هاتو ئەو حیزبە کۆمۆنیستە گوتی: چینی کرێکار دەبێ بەتەنێ و **"وەك چینێك"** بە زۆر بێتە سەرکارو **"دیکتاتۆرێتیی پرۆلیتاریا"** دابمەزرێنێ و ئەو دیکتاتۆرێتی‌یەش حیزبی کۆمۆنیست نوێنەرێتی، ئەوا هاوبیران لەمەدا پشتی ناگرن. چۆنکە هاوبیران لە بنەڕەتەوە باوەڕیان بە کۆمەڵگەی چینایەتی نی‌یە. ئەوان چینایەتی بە نەخۆشیی کۆمەڵگە دادەنێن. کۆمەڵگەیەك کە لە چەند چینێك دروست بووبێ؛ بەلای هاوبیرانەوە، هەستی یەکێتی و پێکەوە نووسان و کولتووری نێو کۆیی (مشترك)ی ئەو کۆمەڵگەیە کەم دەکاتەوە. لەبەر ئەوە هاوبیران لەو باوەڕەدان کە هیچ گەلێك نابێتە نەتەوەیەکی یەك توخم (هاوئاهەنگ) تا جیاوازیی چینایەتیی ئابووری و ڕۆشنبیری لە نێودا بمێنێ. جا کە هاوبیران بۆ کۆمەڵگەیەکی یەکسانی بێ چین هەوڵ دەدەن؛ دیارە بە دیکتاتۆرێتیی هیچ چینێك و هیچ تاکێك و هیچ جۆرە دیکتاتۆرێتییەك ڕازی نابن. هاوبیران باوەڕیان بە ئازادی‌یە و لە ئازادی‌یەوە

دێنــه دەرەوەو دەس پــێ دەکــەن؛ لەبــەر ئــەوە لــە دژی هــەموو جــۆرە دیکتاتۆرێتی‌یەکن.

هــەروەها ئەگــەر حکوومــەتێك یــان حــیزبێك هــەوڵی دا بــۆ (تــأمیم) کردنــی سەرمایەکانی وڵات؛ ئەوا هاوبیران پشتی دەگرن بەو مەرجەی کە **"حکوومــەت"** نەبێتــە خــاوەن مڵــك. بــەڵکو **"کۆمەڵگــە"** ببێتــە خــاوەن مڵــك. چۆنکــە ئەگــەر حکوومەت بوو بە خاوەنی سەرمایە؛ ئەوە مانــای وایــە؛ ئەوانــەی کــە نوێنــەرو کاربەدەستی ئەو حکوومەتەن؛ دەسەڵاتیان بەسەر هۆی بەرهەم هێنان و جۆری دابەشکردنی کــارو دەزگــەی بــیرۆکراتیی بەڕێوەبــەرێتیی ســەرمایەدا دەبــێ، و ئەمەش هیچ جیاوازی‌یەکی نابێ لەگەڵ ئەوەی هــۆی بەرهــەم هێنــان و دەزگەی بیرۆکراتی بەڕێوەبەرێتی بەدەست چەند سەرمایەدارێکی ئەهلی‌یەوە بێ، لەبەر ئەوە دەبێ سەرمایە ملکی هیچ تاك و هیچ چینێك و هیچ حکوومــەتێك نــەبێ؛ بەڵکو ملکی کۆمەڵگە بێ و کۆمەڵگەیەکی یەکسان. بۆ ئەوەی ئەم مەبەستە رون بکەینەوە با بێژین لە وڵاتێکدا حیزبێك یان لــەرێی کودەتایەکەوە یــان لــەرێی هەڵبژاردنــەوە دێتــە ســەرکارو حکوومــەت دادەمــەزرێنێ و خــۆی نێــو دەنــێ **"سۆســیالیت"** و **"پێشــڕەو"** و هــەموو حیزبەکانی دی ڕێبــەند دەکات، یــان رێــی چالاکیی راستەقینە دەگرێ لێیــان و دەســت دەکا بە **"تــــأمیم"**ی بانکــەکان و فابریقــەکان و پرۆژە گــەورەکان و نەخۆشــخانەکان و قوتابخانــەکان و بازرگــانیی دەرەوەو ..هتد واتە هەمووی دەکاتە موڵکی حکوومــەت و ســەرمایەداری گــەروە بەجارێ لە نێو دەبات. ئەوسا هەموو ئەوانەی لە پرۆژەکاندا کاردەکەن لــەباتی ئــەوەی ببنــە فەرمانبــەر و مووچــە خــۆری ســەرمایەدارێکی ئــەهلی، دەبنــە فەرمانبــەرو مووچــە خــۆری مــیری. ئــەم سیســتەمە جیــاوازیی چی‌یــە لەگــەڵ سیســتەمی ســەرمایەدارێتیی ئــەهلی؟ سیســتەمی ســەرمایەدارێتیی ئــەهلی هێندەی ئەم سیستەمی سەرمایەدارێتیی حکوومەتی‌یە خراپ نی‌یە. چۆنکە کە بــازار ئــازاد بــوو؛ خــۆی لەخۆیــەوە لــە نێــو ســەرمایەدارەکاندا پێشــبڕکێ و رکەبەرایــەتی دروســت دەبێ، و لەوانەیە تــا هەندازەیــەك کرێکــارو مووچــەخۆر بتوانن سووت لەم پێشبڕکێ و رکەبەرایەتی‌یە وەربگرن و هێندێ جاریش بتوانن شــکاتی خۆیــان بگەیەننــە مــیری. بــەڵام لــە سیســتەمی ســەرمایەدارێتیی حکوومەتدا، پێشبڕکێ و رکەبەرایەتیی نــامێنێ و شکات کردنیــش لــە دەســت حکوومــەت بەتایبــەتی لــە وڵاتــی یــەك حــیزبی و دیکتــاتۆر و تۆتــالیتێردا زۆر زەحمەتە. جا ئەوسا ئەگــەر هــاتو کارکــەرێك یــان فەرمانبــەرێك مــانی گــرت، یــان

داوای ماف خۆی کرد، ئەوا بە زۆری، یان بە "**یاخی بوو**" یان بە "**سەرکێش**" دەدرێتە قەڵەم و سزا دەدرێ، یان بێ کاردەمێنێتەوەو دەبێ بمرێ لە برساندا.
ئەوەی ئاشکرایە لە ساڵەکانی پەنجاکانەوە تا ئێستە لەو وڵاتانەدا کە پێیان دەگوترێ "**وڵاتی رووبە پێشکەوتن**" و لەرێی حکوومەتە دیکتاتۆری و سوپاییەکانیانەوە کە بە کودەتا هاتوونەتە سەرکار، گەلێك پرۆژەی گەورە و فابریقەی مەزن و بانك و... هتد کراون بە موڵکی حکوومەت، عێراق نموونەیەکی باشە بۆ ئەوە، ئەو حکوومەتانە لەرێی ئەم جۆرە (تأمیم)ەوە توانیویانە خۆیان بکەنە سەرمایەدارێکی دەست بەسەر هەموو سەرمایەیەکدا گرتوو، و بەتایبەتی پاش (تأمیم)ی نەوت؛ توانیان جێ پێی خۆیان باش قایم بکەن و گەورەترین زیان بە زەحمەت کێشان و بیروباوەڕی سۆسیالیزم بگەیەنن بە نێوی سۆسیالیزمەوە.
ئەوەی راستی بێ قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم ماڵی خەڵك کردن بە مڵکی حکوومەت و سەندنەوەی فابریقەیەك لە سەرمایەدارێك و کردنی بە مڵکی حکوومەت؛ بە سۆسیالیزم دانانێ؛ بەڵکو بەدیکاتۆرێتیی تاکی، یان حیزبی، یان دەستەیی دادەنێ. قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم دەبێژێ: "**خاوەن ماڵێتیی تایبەتی**" واتە "**موڵکیەتی فەردی**" "**هی خۆیی**" دەبێ بگۆڕێ بە "**خاوەن ماڵێتیی گشتی**" واتە "**موڵکیەتی کۆمەڵگە**" "**هی کۆمەڵگە**". جا کاتێك کە هەموو هۆیەکی بەرهەم هێنان و هەموو سەرمایەیەك بوو بە "هی کۆمەڵگە"؛ ئەوا ئەودەمە هەموو تاکێکی ئەو کۆمەڵگەیە؛ مافی ئەوەی دەبێ ئەو شتەی پێویستێتی بۆ تێرکردن و دابین کردنی پێویستییەکانی ژیانی خۆی بەدەستییەوە بێ، نەك ببێتە موڵکی. "**بەدەستەوە بوون**" (الاستحواذ) موڵکایەتی (التملك) (هی خۆیی) نییە، "**بەدەستەبوون**" ئەوەیە سووت لەو شتە وەربگریت و لەبەرەکەی بخۆیت و کەس لێت نەسێنێتەوە؛ بەڵام لە هەمان کاتدا نەتوانیت بیفرۆشیت و بیکرێت و لەم رێیەوە خەڵکی دی برووتێنیتەوە. ئێمە دەبێ لێرەدا ئەوەش بڵێین کە لەو دەوڵەتەدا کە هاوبیرانی ئەم قوتابخانە کوردییە هەوڵ دەدەن بۆی؛ "**حکوومەت**" و "**کۆمەڵگە**" دوو دەزگەی جیاواز نین لە یەکدی بەڵکو "**حکوومەت**" "**کۆمەڵگە**" خۆیەتی و "**کۆمەڵگە**"ش "**حکوومەت**" خۆیەتی. دوورییە ژیارییەکانی "**حکوومەت**" و "**کۆمەڵگە**" وەك یەکن و دەچەسپێنە سەر یەکدی. بۆ ئەمەش ئەو دەمە لە هەموو گوند و شارێك و بگرە گەڕەکێکدا لیژنەیەك لەلایەن خەڵکی ئەو جێیە خۆیانەوە دەست نیشان دەکرێ بۆ

بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان بە دەستی خۆیان. ئەوانە هەر خۆیان "**گەل**" و هەر خۆشیان "**حکوومەت**"ن. هێزی تەواوی "**کۆمەڵگە**" بریتی‌یە لە هێزی تاکە تاکەی ئەوانە.

بەم وێنانەی سەرەوەردا بۆمان دەرکەوت کە قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم بۆ دوو ستراتیژی بنچینەیی تێ دەکۆشێ کە هەردووکیان بەرابەریەك و هاوکێش و هاوسەنگی یەك و تەواوکەری یەکن: "**کوردستانێکی ئازاد**" و "**گەلێکی یەکسان**".

"**کوردستانێکی ئازاد**" تەنێ بە "**گەلێکی یەکسان**" دەبرێ بەڕێوە، و "**گەلێکی یەکسان**"یش دەبێ لە "**کوردستانێکی ئازاد**"دا بژێ و ناتوانێ لە "**کوردستانێکی دیل**"دا هەڵ بکا. لەبەر ئەوە "**ئازادی**" و "**یەکسانی**" بەلای هاوبیرانی ئەم قوتابخانەیەوە هاوکێش" و "**تەواوکەر**"ی یەکن، واتە تای تەرازووی ماف ئێتنی ناسیۆنالی و ماف کۆمەڵایەتی جووت بەرامبەری یەکن و پێکەوە چارەسەری دەردەکانی کۆمەڵگە دەکەن. ئەوانەی ئازادن و لە وڵاتێکی ئازاد دا دەژین؛ ناتوانن بە جیاوازیی نێوان خۆیان رازی بن، چۆنکە هەموو جۆرە جیاوازی‌یەکی چینایەتی (چ ئابووری و چ رۆشنبیری) مانای نا ئازادی‌یە. هەموو کۆمەڵگەیەکی یەکسانیش دەبێ ئازادبێ، چۆنکە یەکسانی لە ئازادی‌یەوە هەڵ دەقولێ و تەواوکەری ئازادی‌یە. بە کورتی ئەم سۆسیالیزمە باری ئێتنی ناسیۆنالی و باری کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگە وەك تەواوکەری یەك و هاوکێشی یەك دەبینێت و پێکەوە چارەسەریان دەکات.

لە کۆتایی ئەم باسەدا پێویستە ئەوەش بخەینە ڕوو کە چۆن هاوبیرانی ئەم قوتابخانە کوردی‌یە ناتوانن "**ستراتیژ**" بکەنە قوربانی "**تاکتیك**"، دیارە هەروەهاش ناتوانن بیروباوەڕو بنچینە فەلسەفی‌یەکانیش بکەنە قوربانی تاکتیکی رۆژانەی سیاسەت. ئەم قوربانی‌یە -بەلای وانەوە- تەنانەت نابێ بەڕوواڵەتیش روو بدات. بۆ وێنە هاوبیران دەبێژن: ئێمە کە خاوەنی بیروباوەڕی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالزمین، دیارە هێندێ لایەنی نێو کۆییمان لەگەڵ مارکسیستەکان و کۆمۆنیستەکان و هێندێ بەرەی دی‌دا هەیە. بەڵام ئێمە نە مارکسیستین و نە کۆمۆنیستین. جا ئێمە هەرچەند رێزی هەموو خاوەن بیروباوەڕێك دەگرین، لەوانەش کۆمۆنیست و مارکسیستەکان، بەڵام نابێ ئێمە هێندێ لەو سەرەتایانەیان بۆ بسەلمێنین کە باوەڕمان پێی نی‌یە؛ وەك "**دیکتاتۆرێتیی پرۆلیتاریا**" و "**نوێنەرێتیی تاکو تەنیای پارتی کۆمۆنیست بۆ چینی**

کرێکار" و..هتد. ئەمەش هیچ رێیەك لەوە ناگرێ کە هێندێ جارپێکەوە کاربکەین بۆ هێنانەدی هێندێ ئامانج کە لای هەردووکمان وەك یەکە.

وێنەیەکی دی ئەوەیە کە ئەم قوتابخانە کوردیيە بە پێچەوانەی ماددە پەرستەکانەوە، باوەڕی بەوە نیيە کە ماددە خۆی لە خۆدیدا؛ سەرەتایەکی هێنەرە بووی ژیان و مرۆڤ و گەردوونە. بەڵام ئەمە مانای وانیيە کە هاوبیرانی ئەم قوتابخانەیە لەگەڵ ئاینێکی تایبەتیدان و سەر بە ئاینێکی تایبەتین و جۆری هێنانە بەرچاویان بۆ هێنەرە بوو (خالق)، پڕبە پێستی ئاینێکی تایبەتیيە و ئەو ئاینە هەرچیيەك بێژێ باوەڕ دەکەن پێی. هاوبیرانی ئەم قوتابخانەیە دبێژن: گەلێك لە لایەنگیرانی ئاینە ئاسمانیيەکان؛ هێنەرە بوو (خالق) وا باس دەکەن وەك خۆیان پێیان خۆشە. ئێمە باوەڕمان بە هێنەرە بوویەکە کە مرۆڤ و هەموو گەردوونی دروست کردووە، نەك بە هێنەرە بوویەك کە خەیاڵ و (تصورات)ی مرۆڤ دروستی کردووە.

لەبەر ئەوە ئەگەر هاتوو -یان بۆ نموونە بڵێین- لەگەڵ بەرەیەکی دیانی (مسیحی) لەسەر کارێك رێکەوتین، ئێمە خۆمان لەگەڵ ئاینی دیانێتیدا جووت ناکەین، هەرچەندە لە باری سەرنجی ئاشتی خوازیيەوە، ئێمەش وەك دیانێکی راستەقینە ئاشتی خوازین و داوای ئاشتی دەکەین؛ بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیيە کە باری سەرنجی ئێمە بەرامبەر بە ئاشتی وەك باری سەرنجی کابرایەکی دیانە. بۆ وێنە: بەپێی ئاینی دیانی؛ ئەگەر هاتوو یەکێك زللەیەکی لە پەنا گوێی راستتدا، دەبێ گورج پەنا گوێی چەپت رابگری بۆی؛ تا زللەیەکی دی لێبدا. دە ئێمە باوەڕمان بەم سەرەتایە نیيە. ئێمە پێمان وایە هەموو زۆردارێك دەبێ وای لێ بکرێ کە نەتوانێ زۆر لە کەس بکات، یان ئەگەر دیانێك گوتی لە ئینجیلدا نووسراوە ژن لە بنەڕەتدا لە پەراسووی لای چەپی پیاو دروست بووە، ئێمە ئەمە ناسەلمێنین بۆی؛ چۆنکە باوەڕمان بە یەکسانیی ژن و پیاو هەیە، و پێشمان وانیيە کە خوایەکی دادپەروەری بێ هاوتا ژن بەکەمتر بزانێ لە پیاو.

بە کورتی تاکتیکمان بەرامبەر هەموو خاوەن بیروباوەڕێك دەبێ وابێ کە موویەك لەسەرەتا بنچینەییيەکانی بیروباوەڕەکەی خۆمان لارنەکاتەوە. ئێمە رێزی هەموو لایەك دەگرین کە رێزمان بگرێ و بیەوێ بە شێوەیەکی ئاشتی خوازانە دەمەتەقێ بکات لەگەڵمان. بەڵام ئێمە هیچ کاتێك بیروباوەڕی خۆمان و ستراتیژەکانی خۆمان ناکەینە قوربانی دۆستایەتیی هیچ لایەك و دوو ستراتیژە نەگۆڕەکەمان ناکەینە قوربانی هیچ جۆرە دەسکەوتێکی کاتی نابنچینەیی.

# جەنگی واتەوات و بەرەنگاربوونی

دوژمنانی ئازادی و یەکسانیی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، واتە "هەموو ئەو هێزە تاریکی پەرستانەی کە بەرووتاندنەوەی زەحمەتکێشان؛ کە زۆربەی هەرە زۆری ئادەمزادن لە جیهاندا؛ خۆیان دەژێنن، بۆ دەمکوتکردن و تێکشکاندنی بەرەی چەوساوە و ژێر دەست و بەشخوراو، دوو ڕێی سەرەکی دەگرن: یەکێکیان بەکارهێنانی زۆر و دەست وەشاندن و لە نێو بردنی ئەو کەسانە و ئەو کۆمەڵانەیە کە بەرەنگاری‌یان دەکەن و لە رووی‌یاندا وەردەگرێنەوە و مل بۆ زوڵمو زۆریان کەچ ناکەن. ئەمەش هێندێ جار بەشێوەیەکی راستەوخۆیە و بە زۆری بەرگێکی شەرعی و قانوونی دەکرێ بە بەردا، وەك ئەوەی تاقمێك دزوجەردەی سیاسی بکەونە یەك و دەست بگرن بەسەر دەزگەی فەرمانرەواییی وڵاتێکدا؛ سا یان لەڕێی کودەتایەکەوە، یان لەڕێی قەڵپ کردنی هەڵبژاردنێکی گشتی‌یەوە، یان لە ڕێی هەڵتەکاندنی رای گشتیی گەلێکەوە، و ئەوجا کە هاتنە سەرکار؛ حکوومەتێکی سوپاییی دیکتاتۆری، یان تاك حیزبیی دیکتاتۆری، یان تۆتالیتێری یان ئێتاتیستی یان ئۆتۆکراتی کە دیارە وەك دەبینین؛ پاش دامەزراندنی، زوو یان درەنگ، لەلایەن هەموو دەوڵەتەکانی جیهانەوە بە ڕەسمی‌یەت دەناسرێ و، دوای ئەوە بکەونە دەرکردنی قانون و نەرێتنامە و فەرمانی فاشیستانە، و بە هەر جۆرێك کە خۆیان بیانەوێ، رێ لە ئازادیی کۆمەڵگە بگرن و دەنگی ئازادیخوازان کپ بکەن. هێندێ جاریش هەر ئەم حکوومەتانە خۆیان، کە بەرەسمی لەلایەن کۆمەڵەی نەتەوە یەککگرتووەکانەوە دانیان پێدانراوە و بەڕەسمی ناسراون و بوونەتە فەرمانڕەوای تاکو تەنیا، دەچن بەنهێنی چەند دەستەیەك بکوژ و خوێنڕێژ دروست دەکەن و دەست دەکەن بە کوشتن و بڕینی رەخنەگران و بەرهەڵست کەرانی سیاسی؛ بۆ ئەوەی بە کوشتنیان بەجارێ لە نێویان ببەن. لێرەدا پێویستە بڵێین کە زۆربەی زۆری دەوڵەتەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست و "**جیهانی سێیەم**"ی ئەمڕۆ نموونەی پڕ بە پێستی ئەم قسەیەی سەرەوەن.

ڕێی دووەم: ڕێی پەنابردنە بەر درۆ و دەلەسەیە. راستی‌یەکەی چەکی درۆ و دەلەسە بۆ بێ دەنگ کردن و شکاندنی بەرەی بەرهەڵست کەران و رەخنەگران و نەیاران؛ شتێکی تازە بابەت نی‌یە؛ بەڵکو لە کۆنەوە هەر بووە و لە هەموو جیهاندا باو بووە، و بە تایبەتی لەم رۆژهەڵاتەی ئێمەدا. ئەوەتا یەکێك لە

(تــەعالیم)ەکــانی ئــاینی زەردەشــتی بەربــەرەکانیٰکردنی "**درۆ**"یــە؛ وەك سروشتێکی بنچینەیی "**دێـو و درنـج**". تەنانەت وشەی "درنج" کە لە زمانی کوردیدا هاومانای "**دێـو**"ە؛ لە بنەڕەتدا دەچێتەوە سەر وشەی "**درۆژ**" کە بە زمانە ئێرانییە کۆنەکان هەر "درۆ" دەگرێتەوە. "**درۆزن**" لە نێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا بە پەنددەکرێ و لە نێو کوردەواریشدا بە "**دوژمنی خودێ**" دادەنرێ و دەگوترێ "**درۆزن دوژمنی خوایە**".

هەروەها چەکی درۆ بە چەکێکی کورت هاوێژ دەدرێتە قەڵەم و دەگوترێ: "**دەستی درۆ کورتە**" یان "**درۆزن هەر جارێ ناشتا دەکات**" و..هتد. بەڵام وادیارە چارەسەر کردنێکی بنج بڕی درۆ، جارێ لە وزەی ئادەمزاددا نییە.

"**درۆکردن**" مانای "**دەستکاری کردن و گۆڕینی ڕاستییە بە ئەنقەست**" واتە "**بۆ مەبەستێکی تایبەتی**".

دوژمنانی ئازادی و یەکسانیی مرۆڤ و گشت بەرەی ئیمپریالیزم و دیکتاتۆرێتی و هەموو خوێنمژان و داگیرکەرانی وڵاتان؛ هاتوون لەم چەکە کۆنەی درۆ؛ چەکێکی مۆدێرنی ترسناکیان دروست کردووە؛ کە پێی دەگوترێ "**پرۆپاگەند**"ە و لە نێو کوردەواریدا بە "**پڕۆپالانتە**" نێوی ڕۆیوە و "**دەست بڕین**" و "**فریودان**" دەگەیەنێ. بەهۆی ئەم چەکەوە دەتوانن مێشکی خەڵکی تێك بدەن و ڕێبازی بیرکردنەوەیان تا ماوەیەك بگۆڕن و لە ڕێی ڕاست لایان بدەن و چەواشەیان بکەن و لەم ڕێیەشەوە بچنە مەیدانی جەنگێکەوە کە چەکی وەك تۆپ و فڕۆکەی تێدا بەکار ناهێنرێ؛ بەڵکو چەکی "**قاوداخستن**" و "**قسەو قسەلۆك**" و "**درۆ هەڵبەستن**" و "**بەیتوبالۆرە**" کاری خۆی دەکا، و بەم جەنگەش دەگوترێ "**جەنگی واتەوات**" (حرب الاشاعات).

"**بەرەی تاریکیی جیهان**" کە بریتییە لە هەموو خوێنمژان و ڕووتێنەرەوەکانی مرۆڤایەتی و چەوسێنەرەوەکانی گەلانی ژێر دەستەو کەنەفت کەرانی ژنان؛ بۆ ئەم جەنگە نامەردانەیە بە ملیارد پارە دەبەشنەوە و هەزاران نۆکەرو چڵکاو خۆر و کاسە لێس ڕادەگرن لەوانەی کە ویژدانیان مردووە و ئامادەن هەر بە پارە خۆیان بە هەموو کەسێك بفرۆشن. جا ئەم نۆکەرو بەکرێ گیراوانە، بەتایبەتی هەڵبژاردەن و لەوانەن کە زۆرتر قسەزان و لەبەر سەروزمانی شیرینیان لە نێو خەڵکدا خۆشەویستن و هێندێ جاریش ئەمانە لە نێوان ئەوانەدا هەڵدەبژێردرێن کە لە ڕابوردوودا فشە خەباتێکیان کردووە بۆ ڕێیەکی سیاسی و ئێستە کوڵیان داوە و ڕابوردوو ئێق دەکەنەوە و دەیفرۆشن. یان لە

نێو ئەوانەدا وەردەگیرێن کە پێوەندی‌یان بە ژمارەیەکی زۆر خەڵکەوە هەیە؛ بەتایبەتی خەڵکی ساویلکە و دڵپاك. جا ئەمانە هەموو بە نهێنی؛ هەریەکە دەورێکی تایبەتی پێ دەسپێردرێ و لە کات و جێی تایبەتی‌دا دەنێردرێتە نێو کۆمەڵانی خەڵکەوە بۆچوونە نێو "**جەنگی واتەوات**" و "**قاوادخستن**" و "**کارکردنە سەر بیری خەڵك**" و "**رێ پێ هەڵەکردن**" و "**چەواشەکردن**"یان.

گەورەترین پەلاماری "**بەرەی تاریکی**" لە مەیدانی "**جەنگی واتەوات**"دا بۆ سەر ئەو خاوەن بیروباوەڕ و رێکخراو و کەسایەتی‌یە سیاسی‌یانەیە کە رێ و شوێنی سەربەخۆی خۆیان لە ژیاندا دۆزیوەتەوە و بە پارە و پارووی چەور و قسەی خۆش و دەم شیرین کردن (ارشاء) لە خشتە نابرێن و پشتیان بە خۆیان و کۆمەڵگەی خۆیان و مرۆڤایەتیی زەحمەتکێشی چەوساوەی هۆشیاری خەباتکار قایمەو پارەو پایە و کەشوفشی دنیا کار ناکاتە سەریان و لە هەڕەشەو گوڕەشەش چاویان ناترسێ. نۆکەرە چەپەڵە چڵکاو خۆرەکانی "**بەرەی تاریکی**"؛ بەتایبەتی تیروتوانج دەگرنە ئەم جۆرە کەسانە و بە چرپەچرپ و فسکەفسك و جرتوفرت؛ ژاری درۆ و دەلەسەی خۆیان بڵاو دەکەنەوە بۆ کارکردنە سەر ساویلکە و دڵپاك و لە گوێی گادا نوستوو و لە راستی نائاگا.

بۆ "**بەرەنگاربوون**"ی "**جەنگی واتەوات**"؛ دەبێ مرۆڤ بەر لە هەموو شتێك بزانێت کە درۆزن دوو سروشتی سەرەکی هەیە؛ یەکەمیان: ترسنۆکی، دووەمیان: شت بیرچوونەوە. هەموو درۆزنێك؛ چۆنکە باوەڕی بە قسەکانی خۆی نی‌یە و دەزانێ درۆی کردووە، هەمیشە دەترسێ "**راستی**"ی دەربکەوێ و دەستەکەی بکەوێتە ڕوو و ئێدی نەتوانێ ناشتا بکا، لەبەر ئەوە وەك هەموو درۆزنێك؛ ئازایانە سنگ نایەنێتە پێشەوە. جا لەبەر ئەوەی قسەکانی بێ بناخەن و روویان نەداوە، بەڵکو هەڵبەستراون، ئەوا لەبیریدا نەچەسپاون و شتەکان پاش ماوەیەك یان بەجارێ لە یادی‌دا نامێنن، یان وەك خۆی نامێننەوەو هەرجارە جۆرێکی دەڵێ. کەواتە درۆزن هەر چەندێك خۆی بهێنێ و بباو خۆی بەهێز پێشان بدا؛ وەك ئەو سەرخۆشە وایە کە قسەی زل زل دەکات و دەست بە هەڕەشەو گوڕەشە دەکات و تۆش لە سەرەتاوە پێت وایە ئەمە رۆستەمی زاڵە، کەچی هەر ئەوەندە پاڵێکت پێوەنا، لە هەزار مەتر بەولاوە رەت دەبات. ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دی‌یەوە؛ دەبێ مرۆڤ بزانێ کە ئەو درۆزنە بەکرێ گیراوانەی وەك دەسکەلا لە "**جەنگی واتەوات**"دا بەکار دەهێنرێن، بەزۆری

خۆیان بە "**بێ لایەن**" و "**خێرخواز**" و "**دۆستی هەموو لایەك**" دەدەنە قەڵەم. چۆنکە خەڵکی ساویلکەو دڵپاك، بەزۆری، پێیان وایە ئەوەی "**بێ لایەن**" بوو، یان "**بێ لایەن**" خۆی راگرت ئەوا هەمیشە هەر "**قسەی هەق**" دەکات، کە ئەمەش راست نییە (بگەڕێرەوە بۆ وتاری "**ئازادی و دەسەڵات**").

جا لەبەر ئەوە کاتێك ئەم بە کرێ گیراو و نۆکەرانە کەوتنە درۆهەڵبەستن بۆ بەرەی ئازادی و یەکسانی، یان کەوتنە "**بوختان کردن**" بە یەکێك کە سەر بەو بەرەیە بوو؛ نابێ هاوبیرانی ئەو بەرەیەو مرۆڤی بەشەرەف هەروەك "**گوێگر**" دابنیشن و قسەکەی لێ وەربگرن و دەنگ نەکەن و بێژن "**قەی ناکا، با ناماقوڵی خۆی بکات**" یان لە وەرامی ئەو درۆ و بوختانانەدا تەنێ پێی بێژن "**ئەمە درۆ**"یەو بێ دەنگ بن. هەروەها ناشبێ تووڕەبن و لێبدەن بڕۆن. نەخێر. کە درۆزنێکی بەکرێ گیراوی پڕۆپاڵانتەکەر قسەیەکی گێڕایەوە، و مرۆڤ بە تەواوی زانی ئەمە هەڵبەستراوەو بوختانە؛ دەبێ دەستبەجێ بەو کابرایە بگوترێ "**چۆنت زانی کە ئەمە وایە؟**" جا ئەگەر گوتی "**خۆم دەیزانم و دیومە**"، ئەوا دەبێ داوای ئیسپات بکرێ لێی، و ئەگەر "**ئیسپات**"ی پێشاندا دەبێ "**ئیسپات**"ەکانی ژیرانە شی بکرێنەوە و هورد بکرێنەوە؛ تا درۆکانی دەردەکەون. ئەوجا نابێ بە هیچ جۆرێك بەرۆکی بەربدرێ، تا لەبەر چاوی خەڵکی و چەند جارێك لەسەریەك بەدرۆ دەخرێتەوە.

بەڵام وەك بەتاقی کردنەوە دەرکەوتووە، ئەم درۆزنە بەکرێگیراوانە، بە زۆری، ناوێرن بێژن، "**خۆمان دەیزانین و دیومانە**" یان "**خۆمان ئاگامان لە باسەکەیە**"، بەڵکو دەبێژن "**بیستوومانە**" یان "**وادەڵێن**". لەبەر ئەوە مرۆڤ نابێ واز بهێنێ لێیان، بەڵکو دەبێ دەستبەجێ بڵێ: "**باشە! لەکێ بیستت؟**" و نێوی ئەوانە داوا بکرێن لێی کە گوایە لێی بیستوون. جا ئەگەر نێوی چەند کەسێکی برد، ئەوا زوو بە زوو لەگەڵ ئەوانەدا بەرەو رووبکرێتەوەو بزانرێ ئەوانە چییان گوتووە. هەروەها بشزانرێ ئەوانە کێن و سەر بە چ بەرەیەکن و ئایە ئەوانە خۆیان ئەو باسەیان دیوەو زانیوە یان ئەوانیش هەر بیستوویانەو لە کێش بیستوویانە، و بەم جۆرە ئەم رێیە بگیرێ؛ تا راستیی قسەکە، بەتایبەتی درۆکە، دەردەکەوێ، خۆ ئەگەر کابرا گوتی "**نازانم کێ گوتی، خەڵك گوتیان**" دەبێ پێی بگوترێ "**یان دەبێ بڵێیت کێ گوتی، یان بە ئاشکرا دەڵێین: درۆ دەکەیت و فێرکراویت وا بڵێیت. لەبەر ئەوە تکایە پێمان بڵێ بۆ چ لایەك کار دەکەیت**". ئا بەم جۆرە، بەڵام لە پێش چاوی خەڵك، چەند جارێك و یەك لە دوای یەك تەریق

بکرێتەوەو بهێنرێتە ژەنگ و ژارو هەموو جارێك پێی بگوترێ "درۆزن". ئەوسا مرۆڤ دەبینێ؛ ئەوانەی کە بوونەتە جاشی ئەم لەشکرە؛ چەکەکە لە دەستیان دەکەوێتە خوارێ. ئەوەی راستی بێ؛ چەکی پڕۆپاگانتەو قاوداخستن؛ بۆیە بە زۆری دەتوانن کاری خۆیان بکەن؛ چۆنکە خەڵکەکە کە هەواڵێك دەبیستن؛ هەروا وەك پارەیەکی نەختینە وەری دەگرن و دەیخەنە گیرفانیان و ناچنە بنج و بناوانی، و کە لە ئەنجامدا هەواڵەکە بە درۆ دەرچوو، ئەو کاتەش نایدەنەوە بەڕووی ئەوانەدا کە لێیان بیستوون. جا چۆنکە قسەکە هێندە دەماو دەم دەکەوێ و دەکەوێ و دەستبەجێ بنچینەکەی دەست نیشان ناکرێ، ئەوا سەرچاوەی درۆکە هەر لە سەرەتاوە ون دەبێ و کە پاشە جاریش درۆکە دەرکەوت؛ ئەوا کەس نازانێ کێ کردوویەتی، و خەڵکی هوردە هوردە بیریان دەچێتەوە.

کەواتە؛ باشترین و کاریگەرترین شێوەی بەرەنگاریی درۆزنی بەکرێ گیراو؛ دەمەتەقێیەکی دەست بەجێیی ژێربێژانەی بابەتانەیە لەگەڵی، و ئەگەر کرا شایەت گرتنە لێی و دانەوەی قسەکەی خۆی دووجار و سێ جار و چەند جار بەڕوویدا و لە نێو خەڵکدا. بە کورتی واز لێ نەهێنانێتی هەتا درۆکەی دەردەکەوێ. لەم رووەوە مرۆڤی خاوەن باوەڕ نابێ گوێ بداتە ماندوویەتی و کات بەخت کردن.

جا وەك گوتمان، چۆنکە درۆزن، بە زۆری، ترسنۆکە، دیارە لە کاتی دەمەتەقێی بابەتانەدا دەشڵەژێ و زمانی تەتەڵە دەکات و ڤڕی دەردەکەوێ و لەبەر ئەوەی درۆزن بە زۆری؛ درۆکەی خۆی بەو جۆرەی گوتوویەتی لە بیری نامێنێ؛ ئەوا هەرجارە درۆکە بە جۆرێکی دی دەڵێتەوە. کورد بە خۆڕایی نەیگوتووە **"ئەگەر درۆزن بوویت دەبێ بیرت تیژبێت"**، جا لەم رووەوە دەبێ مرۆڤ بەتەواوی دەقی قسەکانی چەند جارەی پێشووی درۆزنی بیرنەچێتەوە و بە بەراوردکارییەوە بیداتەوە بە چاویدا و لە پێش چاوی خەڵك و بەشایەتەوە.

درۆزنی بەکرێ گیراو؛ گەلێك جار کەڵك لە رووداوێکی بچووك کەجێی رەخنەبێ، یان هەڵەیەکی سووکەڵە کە باسکردن بهێنێ، یان کردەوەی یەکێکی سەر بە بەرەی ئازادیخوازان کە شایانی سەرکۆنە بێ، وەردەگرێ بۆ هەڵمەت بردنە سەر ئەو بەرەیە، یان پەلاماردانی ئەو کەسە و ئەوجا تاوانبار کردن و کافرکردنی هەموویان. جا ئەو درۆزنە بەکرێ گیراوە؛ ناچی باسەکە، یان هەڵەکە، یان کردەوەکە، وەك خۆی بێ دەستکاری بخاتە ڕوو، بەڵکو دەچێ

سەروبۆری بۆ دەکا و کلکوگوێی دەکا و مێشێك دەکاتە گامێشێك و ریسێك دەکاتە گوریسێك. لەبەر ئەوە دەبێ هاوبیری **"بەرەی ئازادی و یەکسانی"** ئەوە بخاتە بەرچاو کە هیچ مرۆڤێکی ئەم جیهانە فریشتە نەبووە و نی‌یە و نابێ، تەنانەت پەیامبەرەکان کە دەڵێن پەیام هەڵگری خودێ بوون و مرۆڤی زۆر بەرز و پاك بوون، هێشتا ئەوانیش **"بێگەرد نەبوون"** و نەشیان گوتووە **"ئێمە فریشتەین"**. هەموو کەسێك خەوش و ناتەواوی و هەڵە و بەسەرچوونی هەیە، و هەموو مرۆڤێك لایەنی بێ هێزی و لاوازی تێدایە و هیچ هاوبیرێکی بەرەی ئازادی و یەکسانی لاڤ خوایەتی و فریشتەیەتی و بێ گەردی و بێ خەوشی لێ نەداوە و ناشتوانێ لێی بدا. لەبەر ئەوە ئەگەر هاتوو درۆژنی بەکرێ گیراو، ناتەواوی‌یەکی دۆزی‌یەوە لە هاوبیرێك، یان لەبەرەکە هەمووی؛ ئەوا ئەو دەمە مرۆڤی بەشەرەف و خاوەن باوەڕ، ئەگەر زانی ئەو ناتەواوی‌یە، یان ئەو هەڵەیە هەیە، ئەوا نابێ داکۆکی بۆ ئەو ناتەواوی‌یە، یان ئەو هەڵەیە بکات، یان بیکا بە ژێر لێوەوە؛ بەڵکو ئەو بەشەی کە راستە لەو بەشەی کە پێوەنراوە جیابکاتەوە و هوردی بکاتەوە و ئەوجا بە درۆژنی بەکرێ گیراو بڵێ **"تۆ تا ئەم هەندازەیە راست دەکەیت، بەلام پێم بڵێ کێ تەواوە و بێ خەوشە لەم جیهانەدا؟ ئایا تۆ خۆت فریشتەیت؟"**. "ئێمە لەباس کردن و رەخنە گرتن لە ناتەواویی خۆمان ناترسین؛ بەڵکو پێمان خۆشە باسی بکەین، چۆنکە دەزانین کە ناتەواوی و هەڵەکردن لەگەڵ خراپەکاری و نۆکەری و چڵکاوخۆری و خۆفرۆشتن و دوژمنایەتی کردنی مرۆڤایەتی و تاوان کردن، ئەرز و ئاسمان جیاوازن. ئێمە هەوڵ دەدەین تا بتوانین خۆمان لە هەڵە دووربخەینەوە و لە هەڵە پاك بکەینەوە. بەلام تۆ مەبەستت لەم باسە دەستکاری کراوە راست کردنەوە نی‌یە، بەڵکو وەك عەرەبەکە دەڵێ **"كلمة حق أريد بها باطل"**ە.

جا بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ لەسەر ئەو ناتەواوی‌یە، ئەگەر هەبوو، دەمەتەقێ بکات؛ دەبێ هەمیشە ئاگای لە هەموو کەینوبەینێکی نێو بەرەی ئازادی و یەکسانی و رێکخراوەکانی بێت و هەوڵ بدات هەموو شتێك بزانێت، خۆ ئەگەر باسی شتێك کراو هاوبیرێك یان مرۆڤێکی بەناموس ئاگای لێی نەبوو، نابێ لە خۆیەوە هەڵ بداتێ و قسە بکات لەسەری بەڵکو دەبێ بڵێت: **"ئاگام لەمە نی‌یە"** بەلام زوو بپرسێ و لە کورتترین کاتدا مەسەلەکە لەگەڵ کابرای درۆژنی بەکرێ گیراودا رۆن بکاتەوە و بیبرێتەوە لەگەلی و لەبەردەمی خەڵکدا باسی بکات. لەبەر ئەوە؛ ئەوەی هاوبیری بەرەی ئازادی و یەکسانییە؛ دەبێ بەرەکەی خۆی

زۆر باش بناسێت و شارەزای هەموو کەلوقوژبنێکی بێت. بەڵام دەبێ بزانین کە خۆناسین بە تەنیا بەس نییە، بەڵکو ئەوانەی کە پێوەندییان بە بەرەی ئازادی و یەکسانییەوە هەیە، بەدۆست و نەیارەوە؛ بە قووڵی بناسێ. بەبێ ئەم ناسینە قووڵە هیچ هاوبیرێك ناتوانێ هەڵوێستی خۆی ساخ بکاتەوە بەرامبەر درۆژنێکی بەکرێ گیراوی وا کە باش دەرزیدا درابێ و شارەزاییەکی زۆری هەبێ لەکاروباردا و زمانی درێژ و تەڕ و پاراوبێ. چۆنکە خەڵکی بەگشتی، بەتایبەتی ساویلکە؛ گوێ بۆ ئەوانە رادەگرن کە شتیان زۆر لەبەرە و زۆر دەزانن و شارەزایی پێشان دەدەن و وەك کوردەکە دەڵێ "**مەلابەزێنن**" و ئاگاداری ئەم لاو ئەولان، ئەمە بێ ئەوەی راستی و درۆی نێوەڕۆکی قسەکانیان شی بکەنەوە.

شایانی باسە کە ئەم درۆژنە بەکرێ گیراوانە؛ هەر لە نێو یەك دەستەی تایبەتی، یان کۆمەڵی تایبەتیدا، ناکەونە "**جەنگی واتەوات**"؛ بەڵکو دەچنە نێو هەموو دەستەو کۆمەڵێکەوە و خۆیان بە درۆ دەکەنە هاوڕێ و دۆست و بگرە برای هەموو لایەك و هێندێ جاریش دەوری "**ریش سپی**" و "**راوێژکەر**" و "**نێوبژی کەر**" دەگێڕن و لە رێی ئەو "**بێ لایەنی**"یە درۆژنەیەوە کە باسمان کرد؛ دەتوانن لە نێو هەر دەستە و کۆمەڵێکدا جێی خۆیان بکەنەوە، و هەر لە سەرەتاوە هەوڵ دەدەن کە لە بیروکردەوەی هەموو ئەو دەستەو کۆمەڵانە بگەن و بزانن ئەمانە چی کار دەکاتە سەریان، بەچی دڵیان خۆش دەبێ و لە چی تووڕە و دڵتەنگ دەبن، ئەوجا دەچن بەو پێیە دەست بەدرۆ دەکەن بۆیان و هانیان دەدەن و تیژیان دەکەن و لە هەمان کاتدا دەیانهێننە قسەو قسەکانیان دەچننەوە و بەجۆرێکی دەستکاریکراو بۆ دەستەو کۆمەڵەکانی دی باس دەکەن و بەمە ناکۆکی دەخەنە نێوانیانەوە. خۆ کە کەوتنە "**جەنگی وات وات**" دژی کۆمەڵێکی سەر بە بەرەی ئازادی و یەکسانی؛ ئەوا لە نێو هەر کۆمەڵێك یان دەستەیەکی دیدا جۆرە درۆ و بوختانێك رێك دەخەن بۆیان، بۆ وێنە: ئەگەر چوونە نێو تاقمێك موسوڵمانی نوێژ کەرو رۆژوو گرەوە؛ پێیان دەڵێن: "**ئەوانە کافرن و باوەڕیان بە ئیسلام نییە**". خۆ ئەگەر چوونە نێو دەرەبەگ و دەوڵەمەند و سەرمایەدارەکانەوە؛ دەڵێن "**بابە ئەمانە سۆسیالیستن**" و سوسیالیزمیشیان واتێ دەگەیەنن کە ئەگەر سبەی رۆژێ سۆسیالیستەکان هاتنە سەر کار؛ ملك و زەوی و پارە لە هەمووان دەسێننەوە و دەیبەن بۆ خۆیان واتە ئەوان دەکەنە هەژار و خۆشیان دەوڵەمەند لە جێی ئەوان. خۆ ئەگەر چوونە نێو تاقمێك عەرەب و ترك و فارسی شۆڤینی و کۆنەپەرستەوە؛ دەڵێن:

"**ئەمانە رقیان لە عەرەب و ترك و فارسە، و دەیانەوێ كوردستانێكی سەربەخۆ دروست بكەن و جیابوونەوە خوازن**".

خۆ ئەگەر چوونە نێو مرۆڤی فاشیست و نازی و دیكتاتۆرەوە؛ دەڵێن "**ئەمانە كۆمۆنیستن كە رۆژێ هاتنە سەركار ئەشكەوت لە هەر كەسێك كە كۆمۆنیست نەبێ دەكەنە كونە مشك**".

خۆ ئەگەر چوونە نێو دەستەیەك لەلایەنگیرانی دێمۆكراسی‌یەوە؛ دەڵێن "**ئەمانە نازین. ئەوە نی‌یە سۆسیالیزمەكەیان نێو ناوە قوتابخانەی كوردیی سۆسیالیزم**". خۆ ئەگەر چوونە نێودیان و جوولەكەوە دەڵێن "**ئەمانە موسوڵمانی تەنگە تیلكەن؛ ئەوە نی‌یە دەڵێن: باوەرمان بە ماددە نی‌یە وەك سەرچاوەیەك بۆ بزواندنی هەموو چالاكی‌یەكی مرۆڤ و ئەمەشیان لە قورئانەوە وەرگرتووە**". خۆ ئەگەر چوونە نێو كۆمەڵێك پیاوی كۆنەپەرستی دواكەوتووی دژ بە ئازادیی ژنانەوە؛ دەڵێن "ئەمانە باوەریان بە یەكسانیی ژن و پیاوە. لەبەر ئەوە ئەگەر دەستیان بوو؛ هیچ ژنێك نامێنێ كە حەوت مێردی نەبێ". بە كورتی: بۆ بەرگری لەم بوختانە جۆرجۆرانە؛ دەبێ هاوبیری بەرەی ئازادی و یەكسانی؛ پێوەندیی بە هەموو چین و دەستەو كۆمەڵ و تاقمێكی كۆمەڵگەوە هەبێ، و بەرە بەرەو لەسەرخۆ هۆشیاریان بكاتەوە و هەر كاتێك شتێكی لەم جۆرەی بیست؛ دەمودەست بیباتەوە سەر بنچینەی خۆی و لە نێو جەماوەردا بە درۆی بخاتەوە و بە پەندی بكات.

راستی‌یەكەی زۆرتر چوونە نێو جەماوەر، لەم رووەوە سووتێكی دیشی هەیە؛ ئەو سووتەش لە كاتێكدا دەردەكەوێ كە بەرەی تاریكی لە رێی نۆكەرە درۆژنە بە كرێ گیراوەكانی‌یەوە هەر لە نێو تاكە تاكەی خەڵكدا نەكەوێتە كار؛ بەڵكو بە نووسینی وتاری رۆژنامە و چاپكردنی بڵاڤۆك و لێدوانی رادوێ و تەلەفزوێن و لە سنوورێكی نێوچەیی یان جیهانی‌دا بكەوێتە كار.

ئەوجا بەرەی ئازادی و یەكسانی، چۆنكە لەم رۆژەدا دەسەڵاتی ئەوەی نی‌یە -وەك ئەوان- دەستاوێژ (وسیلة)ی تەكنیكی مۆدێرن بخاتە كار، دیارە لەم حاڵەدا پێوەندیی بەستن بە جەماوەری وڵاتی خۆوبێگانەوە، و بەتایبەتی بە جەماوەری زەحمەتكێش و رۆناكبیری ئازادیخوازی وڵاتانەوەو بەو كۆمەڵانەوە كە ئازادیخوازن لە جیهاندا و لە هێندێ رووەوە هاوكێشن لەگەڵ "**بەرەی ئازادی و یەكسانیی كورد**"؛ دەبێتە هۆی زاڵ بوون بەسەر پرۆپاڵانتەی هەڵگیرسێنەرانی "**جەنگی وات وات**"دا، یان هیچ نەبێ كزكردنی هێزی واتەواتیان.

لێرەدا پێویستە دەست بۆ ڕاستی‌یەکی زۆر گرنگ ڕابکێشین؛ کە ئەوەش ئەوەیە؛ ئەو کۆمەڵەو دەستانەی سەر بە **"بەرەی ئازادی و یەکسانین"**، بە زۆری، ناتوانن لە هەموو کات و لە هەموو جێیەکدا بە ئاشکراو سەربەست بێنە پێشەوەو ڕەئی خۆیان ئازادانە و بێ ترس بڵێن و لەسەر خۆیان بکەنەوە و بەرەنگاری درۆو بوختانی **"بەرەی تاریکی"** ببن. چۆنکە ئەم کۆمەڵ و دەستانە، بە زۆری، لەلایەن ئەو دەوڵەت و فەرمانڕەوایی و هێزانەوە کە سەر بە بەرەی تاریکین ڕێبەندکراون و ڕێبەند دەکرێن و ڕێی کارکردنی ئاشکرایان لێ گیراوە و لێ دەگیرێ و ناچار بوون و ناچارن بەنهێنی و دزێتی‌یەوە کاربکەن. جا ئەو دەسەڵاتە کەمەو ئەو ماوە تەنگەی هێزێکی بەنهێنی کارکردوو بۆ دەربڕینی دەنگی خۆی هەیەتی؛ بەراورد ناکرێ لەگەڵ دەسەڵاتی یەکجار گەورەی دەوڵەتێك یان هێزێکی فەرمانڕەوای بە ئاشکرا کار کردوو. لەبەر ئەوە **"بەرەی تاریکی"**، بەشێوەیەکی گشتی؛ کەڵك لەم حاڵە وەردەگرێ و دەکەوێتە بوختان و درۆو دەلەسە و خۆشکردنی **"جەنگی واتەوات"** لە دژی بەرەی ئازادیخوازی نهێنی کارکردن بەسەردا سەپاو. شتێکی خۆیایە (واضح) کە درۆ هەڵبەستن و بوختان کردن بەوانەی بەنهێنی کاردەکەن و پڕۆ پاڵانتە کردن لە دژیان گەلێك هاسانترو کاریگەرترە، لە نێو خەڵکدا، لە درۆ هەڵبەستن و بوختان کردن بەوانەی بە ئاشکرا کاردەکەن. ئەمەش لە مێژووی گەلەژێردەستەکاندا، و بەتایبەتی لە مێژووی گەلی کورددا؛ زۆر بە چاکی دیارە. بۆ وێنە: لە کاتێکدا کە خەلیفە ترکەکانی دەوڵەتی عوسمانی ئاینە کوردی‌یە کۆنەکانی وەك ئاینی کاکەیی و ئاینی ئێزدی و ئاینی عەلەوی و ئاینی هەقەیان ڕێبەند دەکرد و هەر کەسێك بە ئاشکرا خۆی بە لایەنگری ئەو ئاینانە بزانیایە؛ بە نێوی ئەوەوە کە کافرە؛ خوێنیان حەڵاڵ دەکرد و هەر ساتەناساتێ بە لەشکرەوە پەلاماری ئەو نێوچە و هۆزانەیان دەدا کە سەر بەو ئاینانە بوون؛ دەچوون لە نێو خەڵکی ساویلکەدا **"جەنگی واتەوات"**یان دژی ئەم ئاینانە و لایەنگرەکانی هەڵ دەگیرساند. بۆ وێنە؛ وایان بڵاودەکردەوە کە گوایە ئێزدی‌یەکان **"شەیتان پەرستن"**، ئەمە لە کاتێکدا ئەوانەی باش شارەزای ئاینی ئێزدین؛ دەزانن کە ئێزدی‌یەکان لە بنەڕەتەوە هەر باوەڕیان بە بوونی **"شەیتان"** نی‌یە بەو شێوەیەی کە موسوڵمانان بۆی دەچن. جا کەسێك کە باوەڕی بە بوونی شتێك نەبێ؛ چۆن ئەو شتە دەپەرستێ؟ هەروەها کاکەیی‌یەکانیش هەر لەسەتەی ڕابوردووەوە و بگرە زووتریش ئەو بوختانە کراوە پێیان کە گوایە ئەمانە هەموو ساڵێك

شەوێکیان هەیە کە نێوی "**شــەوەڕەش**" یـان "**چراپـف**"ە، و لـەو شـەوەدا ژنـان و پیاوانیـان کۆدەبنـەوە و چرادەکوژێننــەوەو هەریەکـە بەردەبێتـە ئـەوی دەسـتی بیگاتیێ. ئەم قاوە، نەك تەنیێ لەلایەن ترکە عوسمانی‌یە خوێنمژەکانەوە داخراوە بـۆ بـەد نێـو کردنـی کاکـەیی؛ بـەڵکو شـان بـە شـانی ئـەوانیش هێنـدیێ لـەو ئەورووپایی‌یانـەی نۆکـەر و جاسووسـی بـەرەی کۆلۆنیالیسـتەکان بـوون؛ وەك (مۆریتزڤاگنەر) و (فردریك میلینگن) هەمان بەیتو باڵوەریان لێ داوە.

بێگومان ئەم بوختان و واتە واتە؛ کاری کردووەتە سەر خەڵکی ساویلکە و بگـرە خوێندەواریـش. ئەوەتـە کابرایـەکی ژیرەکـی زۆرزانـی وەك شـێخ رەزای تاڵەبانی ئەم درۆ و بوختانە بەرامبەر کاکەیی‌یەکان دووبارە دەکاتەوەو دەڵێ:

**هەتـانە، هەر وەکو بیستوومە بەزمێ**

**لە ساڵێکا شەوێ یارانی دیندار**

ئێستە ئەگـەر سـەرنج بدەینـە شـەکرە شـکێنراوەکانی شـێخ رەزا؛ دەبینـین کاتێك ئەو ئـەم هـەموو بوختـان و درۆیانـە دەگێڕێتـەوە؛ هـەر لەسەرەتاوە دەڵێ "**بیستوومە**" و ناڵێ "**دیومە**". جا نەك هەر شێخ رەزا، بەڵکو هیچ کەسێکی دیـی ئەم جیهانە؛ نە "**شەوەڕەش**"ی دیوە و نە "**شەوەڕەش**"یش هەیە. بەڵام وەك چۆن ئێزدی‌یەکان نـەیانوێراوە خۆیـان ئاشکرا بکـەن و بڵێـن: "**ئێمـە ئـێزدین و ئەمـە ئاینەکەی ئێمەیە و ئێمە شەیتان پەرست نین و ئەوانە شەیتان پەرستن کە خوێنی ئێمە بـەناڕەوا دەرژێنـــن و ئەمـــە هـــەموو بوختانـــە بـــە ئێمـــە دەکـــرێ**"، هـەروەها کاکەیی‌یەکانیش نەیانوێراوە بە ئاشکرا بێنە پێشەوە و بڵێن "**بابە ئێمە کاکەیین و ئەوە ئاینەکەمانە و وایەو وایە و شەوەڕەش بوختانە و پێمان دەکرێ**". چۆنکە ئەوان ئەگـەر وا بـە ئاشـکرا بهاتنایـە پێشـەوە، ئەوسـا دەبـوو ئـێزدێتی و کاکەیـەتی خۆیان بەجارێ دەربخستایە وئەو دەمە دووچاری مەترسیی مەرگ و لەنێوبردن دەبوون و خوێنی خۆیان حەڵاڵ دەکرد بە دەستی ئەو سەختگیرە کوێرانەی لە هیچ جۆرە خوێنرێژی‌یەك ناپرنگێنەوە (بگـەڕێرەوە بـۆ وتـاری "سـەختگیریی کوێرانـەو سـەختگیریی بینایانـە). جـا ئـەمڕۆش مەسـەلەی کۆمـەڵ و پارتـە سیاسـی‌یە ئازادیخوازەکـانی کوردسـتان و هـەموو بـەرەی ئازادیخوازانی جیهان وەك مەسـەلەی ئـێزدی و کاکـەیی و هەققـە و عەلەوی‌یـەکان وایـە. لەلایەکـەوە ڕێیان نادرێ ئازادانە و بێ تـرس و بە ئاشکرا باسـی بیروباوەڕو رێـی خۆیـان بکەن، و لە لایەکی دیکەشەوە چۆنکە ناچارن بەنهێنی کاربکەن؛ هـەزاران درۆ و دەلەسـەو بوختـان رێـك دەخـرێ بۆیـان، ئـەوانیش چۆنکـە ناچـارن بەنـهێنێتی

بمێیننەوە، چۆنکە لە ترسی کوشتن و بڕین ناتوانن خۆیان دەربخەن و بە ئاشکرا قسەکانی دوژمنان و نۆکەرانی بەرەی تاریکی بە درۆبخەنەوە، ئەوا لە وێستاوێکی زۆر نالەباردان.

ڕێکخراوی "**کـــاژێك**"، نموونەیەکی زیندووە بۆ ئەم ڕاستی‌یە. ئەوەبوو "**کاژێك**" هەر لەسەرەتای هاتنەکایەوە؛ لە هەموو کوردستاندا و لەلایەن هەموو هەلپەرست و هەڵمەتەکاسەیەکی سیاسەتەوە بەوپەڕی توندوتیژی و بەنێوی ئەوەوە کە "**جیابوونەوە خـــوازە**" بەربەرەکانیٚ کرا. وریێی کارکردنی لیٚ دەگیرا و ئەوی کاژیکیش بوو لە ترسی کوشتن و بڕین و ماڵوێرانی؛ نەی دەتوانی بە ئاشکرا بێژیٚ "**کـــاژێکم**" چۆنکە بوونە کاژێك باسی سەربوو؛ لە هەمان کاتدا دەستی ڕەشی بەرەی تاریکی دەیگوت "**بابە کاژێك کوا هەن؛ هـــەموو دووکـەس و لەتێکن، فەرموو ئەگەر هەن بۆ نایەنە پێشی**"؛ کەچی هەر ئەوانەی دوێنیٚ پیٚیان بە سێبەری هەموو هاوبیرێکی کاژێك دادەنا؛ ئەمڕۆ قسەکانی چارەکە چەرخێك لەمەوبەری کاژێك -بەلاٚم بە کاڵوکرچی- دەجوون و دەجوونەوە و لە خراپەکاری خۆشیان هەروازیان نەهێناوە.

بۆ بەرەنگاربوونی ئەم بارە نالەبارە؛ پێویستە بەرەی ئازادی و یەکسانی و هەموو ئەوانەی ئازادیخوازو دێمۆکرات و مرۆڤ دۆستن، و هەموو ئەوانەی ئازادیی کۆمەڵگە بەلایانەوە بەنرخە؛ بکەونە خۆیان و ئەوانیش خۆیان بۆ "**جەنگێکی دژواتەوات**" ئامادە بکەن. هاوبیرانی "**بـەرەی ئـازادی و یەکســانی**" و لێرەشدا مەبەستم لە هیچ ڕێکخراوێکی تایبەتی نی‌یە، بەڵکو مەبەستم لەوانەیە کە سەر بەو بیرو ڕیٚیەن، دەبیٚ هەوڵ بدەن بەر لە هەموو شتێك "**بەرەی تاریکی**" زۆر باش بناسن و بەتایبەتی لە دوولاوە: لەباری ئیدیۆلۆژی و لەباری جۆری لایەنگیرەکانی‌یەوە؛ واتە لایەنی بەهێزی و لاوازی‌یانەوە. بۆ ئەمە پێویستە هەموو بنەڕەتە بیری‌یەکانی (الاسس الفکریة) "**بـەرەی تـاریکی**" بەشێوەیەکی زانستانە شی بکرێنەوە و ناتەواوی و کەموکورتی‌یەکانی، بەتایبەتی ئەو لایەنانەی کە دژی مرۆڤایەتین، لێك بدرێنەوە و بە جەمسەری کردەوە خراپەکانیانەوە پێشکێش بە کۆمەڵانی خەڵکی بکریٚ؛ بەلاٚم دیارە ئەمەش لە کات و شوێنی خۆی‌دا، و لەم ڕووەوە هیچ چاوپۆشی‌یەك نەکریٚ.

لێرەدا دەبیٚ ئەوە بڵێین کە شێوەی "**جەنگی دژواتـەوات**"؛ نابیٚ ئەو شێوەیە بگریٚ کە بەرەی تاریکی گرتوویەتی؛ واتە نابیٚ لە درۆ و دەلەسە و بوختان بۆ هەڵبەستن و پێوەنان پێك هاتبیٚ. بەرەی ئازادی و یەکسانی بەرەی ڕۆناکییەو

ئەو ڕێیە چەوتە چەوێڵە چەپەڵەی بەرەی تاریکی ناگرێتە بەر؛ چۆنکە ئەو مێتۆدە لەگەڵ سروشتی ڕۆناك و پاکیدا ڕێك ناکەوێ. بێجگە لەوەش پێویستی بە درۆ هەڵبەستن و بوختان کردن نییە؛ چۆنکە بەرەی تاریکی هێندە پیسی و گوناه و تاوانی زۆرە، کە پێویست بە شت دروست کردن نەکات بۆی. بە کورتی دەبێ "**جەنگی دژواتە واتە**" تەنێ ڕێی ڕاستیی خستنەڕوو و لایەنی ڕاستی بگرێ. بەڵام دەبێ باش بزانرێ کە ئەو ڕاستییە کەینێ و لە کوێ و چۆن و بە چ شێوەیەك دەگوترێ و دەردەبڕرێ.

ئەمەش هونەرێکە بە مرۆڤی دەست ڕەنگینی خۆی نەبێ؛ بە هەموو کەسێك ناکرێ؛ با ئەو کەسە زیرەك و زۆرزان و دڵپاکیش بێ. دەبێ ئەوەمان هەمیشە لەبەر چاوبێ؛ کە مرۆڤێکی ئازادیخوازی یەکسانی ویستی ئاشتی پەروەری دڵپاك، ناتوانێ هەموو کاتێك بەرامبەر بە دوژمنێکی پڕ چەکی بێ ویژدانی بێ ئابڕووی دەست وەشێنی درۆژنی بوختانکەری پشت پێ نەبەستراو؛ ڕووی ئازادیخوازانە و دڵی پاك و نیازی چاکی خۆی پێشان بدات. بۆ وێنە: بەرامبەر زەلامێك کە لە تاریکیدا وەستاوە و بەرد دەگرێتە سەروچاوت و دەیەوێ کوێرت بکات، تۆ ناتوانیت و نابێت هەر لە ڕۆناکیدا بوەستیت و دەموچاوی خۆتی پێشان بدەیت و بڵێیت "**فەرموو وەرە پێشەوە با بەرامبەر یەك بوەستین و سوارچاکانە شەڕەشیر بکەین، کێ بردییەوە، ئەوە شێرو ڕۆستەمی مەیدانە**". چۆنکە ئەو نایەتە بەر ڕۆناکییەکە و ڕووبەڕووی تۆ ناوەستێ و لەبەرد هاویشتنی خۆی ناکەوێ. خۆ ئەگەر وابوایە ئەویش مەردێك دەبوو وەکو تۆ و سەر بە بەرەی ڕۆناکی دەبوو و ئەم شەڕ و هەڵایەی لەگەڵ تۆ نەدەکرد. لەبەر ئەوە بەرەی ئازادی و یەکسانی؛ بۆ پاراستنی خۆی؛ بۆی هەیە، بە پێی پێویست، شتی وا بڵێت و قاوی وا دابخات کە سەر لە بەرەی تاریکی تێك بدات. ڕۆستەمی و سوارچاکی بەرامبەر کەسانێك، یان کۆمەڵانێك دەخرێتە کار، کە ئەو کەسانەش یان ئەو کۆمەڵانەش خۆیان لە بەرەی ڕۆستەمی و سوارچاکی دابن، یان هیچ نەبێ قەدری ڕۆستەمی و سوارچاکی بزانن و بگرن.

ئەو خوێنمژانەی گەلە چەوساوەکانی ئەم جیهانە دەڕووتێننەوە، و ئەو فەرمانڕەوایانەی هێزو دەسەڵاتی خۆیان بەهۆی دیل کردنی مرۆڤی بەشخوراوی ئەم جیهانەوە دەسکەوتووە؛ هەروەها ئەوانەی کوردستانیان داگیرکردووە و هەموو مافێکی گەلی کوردیان پێشێل کردووە؛ هیچ کاتێك نەڕۆستەم بوون و نە بەڕۆستەمی و ئازایەتی گەیشتوونەتە ئەوە. لەبەر ئەوە

ئەگەر هاتوو بە کریٚ گیراویٚکی درۆزن شتیٚکی پرسی لیٚت؛ بۆ ئەوەی زمانت بدزیٚ یان قسە دابکیٚشیٚ لە سەرت؛ تۆ پیٚویستە شتیٚکی وا بلیٚیت پیٚی، کە دوودلی بکەیت و سەری لیٚ تیٚك بدەیت بە چەشنیٚك کە زانیاری‌یەکی وا بباتەوە بۆ ئاغاکانی بە هیچ جۆریٚك سووت نەبینن لیٚی. هەروەها ئەگەر نۆکەریٚکی بەرەی تاریکی هات و خۆی بە بیٚ لایەن دایە قەلەم و دەستی کرد بە بوختان کردن و خستنەرووی کەموکورتی‌یەکانی بەرەی ئازادی و یەکسانیی بە جۆریٚکی دوژمنانە و ناڕاست و نا بابەتانە؛ بۆ ئەوەی دەماری هاوبیریٚکی بەرەی ئازادی و یەکسانی بگریٚ کە هیٚشتا دەرنەکەوتووە بۆی، هاوبیری بەرەی ئازادی و یەکسانی نابیٚ یەکسەر بپژیٚتەوە بەچاوی‌دا؛ بەلکو دەبیٚ جاریٚ زۆر بە وریایی هەولٚ بدا بزانیٚ ئەو نۆکەرە **"بیٚ‌لایەنە"** درۆزنە سەر بە چ لایەکە، و ئەوجا لە نیٚو خەلکدا کەموکورتی و خراپەکاریی ئەو لایەنە لە پیٚش چاوی ئەو نۆکەرە بخاتە ڕوو؛ بەلام وەك گوترا بە شیٚوەیەکی بابەتانەو بە جۆریٚك کە ئەو خەلکەی دەوروپشت تیٚی بگەن و لیٚی بگەن. ئەوسا مرۆڤ دەبینیٚت کە ئەو نۆکەرە بەکریٚ گیراوەی خۆی بە درۆ بیٚ‌لایەن پیٚشان دەدات؛ بەزۆری، خۆی ناگریٚ و کە گویٚی لە رەخنە لیٚ گرتنی لایەنەکەی خۆی و ئاغاکانی بوو؛ دەست بەجیٚ لەسەریان دەکاتەوە؛ ئەوجا مرۆڤ دەبیٚ وەستایانە وتوویٚژی لەگەلٚ بکا و بۆ خەلکەکەی ساخ بکاتەوە کە ئەو نۆکەرە سەر بەو لایەنەیە و بیٚ لایەن نی‌یەو درۆزن و بەکریٚ گیراوە و بەمە دەستەکەی بخاتە ڕوو و بەرامبەر بە پیٚکهیٚنانی دەورەکەی خۆی دوودلی بکات.

دوودلٚ کردن و خستنە گومان؛ هەموو کاتیٚك بیٚ هیٚزی و سەرلیٚ تیٚکچوون و نەهیٚشتنی دەسەلاتی بڕیاردانی لەدووایە.

**"بەرەی تاریکی و لایەنگرەکانی"** پیٚویستە هەموو کاتیٚك لە **"جەنگی دژ واتەوات"**دا وا دوودل بکریٚن و بەجۆریٚك بخریٚنە گومان کردنەوە لە خۆیان؛ کە هیچ بڕیاریٚك نەتوانن بدەن یان لەسەر هیچ بڕیاریٚك نەتوانن بمیٚننەوە.

بە کورتی: ئەم **"جەنگی واتەوات"**ە؛ جەنگیٚکی یەکجار سەختە لەنیٚوان دوو بەرەدا: **"بەرەی تاریکی"** کە بریتی‌یە لە دزو درۆزن و نۆکەر و چلکاوخۆر و ویژدان مردوو و دەستبڕو دیکتاتۆر و ملهوڕ و فاشست و ئیمپریالیست و تۆتالیتاریست و کۆلۆنیالیست و چەوسیٚنەرەوەی گەلان و ڕووتیٚنەرەوەی زەحمەتکیٚشان و کەنەفتکەری ژنان و، **"بەرەی ڕۆناکی"** یش هەموو مرۆڤ

دۆستان و ئازادیخوازانی یەکسانی خوازان و دیمۆکراتی راستەقینەو دڵپاك و سەرڕاست و بە ویژدان و خێرخواز دەگرێتەوە.

پێویستە لایەنگیرانی بەرەی رۆناکی واتە هاوبیرانی بەرەی ئازادی و یەکسانی بە هیچ جۆرێك رێ نەدەن نا هومێدی و بێ هیوایی رێ بدۆزێتەوە بۆ دڵ و دەروونیان و باوەڕیان بە خۆیان و بەرەکەیان؛ بە هیچ گۆڕانێکی دەورووپشتیان، لە جێی خۆی نەلەقێ، و باش بزانن کە پەنابردنی بەرەی تاریکی بەدرۆ و دەلەسە هەڵبەستن و بوختان کردن و ناڕەواییی سەپاندن؛ تەنێ نیشانەی بێ هێزی و هیچ لەباردانەبوویی و ترس و لەرزی ئەم بەرە تاریکە نووتەکەیە لە بەرەی رۆناکی و لە رۆژی رۆناکی رەخشان و ئەمەش بەڵگەیەکی بنج بڕە بۆ هەوڵوتەقەلای خۆڕزگارکردنی ئەم بەرەتاریکە لەمەرگی سەخت و تاڵ (الموت الزؤام). بێجگە لەوەش مرۆڤ دەبێ لە **"دێوو درنج"** چاوەڕوانی چی بێ؟ لە پەلاماردان و مرۆڤ خواردن و خوێنڕشتن و تەلیسم لێدان و مووهەڵ کزاندن و جادوو و فێڵ و کەڵەك و پاشقول گرتن زێتر؟

جا هەرچەندە بەرەی تاریکی لەسەر ناهەق و بەرەی رۆناکی لەسەر هەقە، بەڵام سەرکەوتن و زاڵ بوونی هەق بەسەر ناهەقدا لە کاتێکی تایبەتی و جێیەکی تایبەتیدا، لەسەر رادەی تێکۆشانی بێ وچان و خەباتی بێ پسانی لایەنگیرانی هەق وەستاوە؛ تێکۆشانێك کە بیروباوەڕی ئازادیخوازانەی یەکسانانەی لە چوارچێوەی دەزگەیەکی سیاسیی پتەودا رێك خستبێ و هەمیشە لە کاردا بێ و بەرەو ئامانج بەرێوە بێ و بە هیچ پڕوپاڵانتە و واتەواتێك پشتی ساردنەبێتەوە.

بەرەی ئازادی و یەکسانی؛ واتە بەرەی رۆناکی کە لە دەزگەیەکی سیاسیی پڕ بە پێستی شایانی خۆیدا رێك خرا و کەوتە تێکۆشان و جەماوەریش پشتی گرت؛ ئەوا دەتوانێ سەربکەوێ.

بەرەی ئازادی و یەکسانی دەبێ هەر سەربکەوێ. چۆنکە ژێرکەوتنی بەرەی ئازادی و یەکسانی مانای سەرکەوتنی بەرەی تاریکییە و ئەمەش مانای زاڵ بوون و فەرمانڕەوایی و دەست رۆیشتنی زۆرداری و نالەباری و چەوسانەوە و ژێردەستەیی و دیلی و نائازادی و نایەکسانییە و تف لەو رۆژە.

# سەختگیریی کوێرانەو سەختگیریی بینایانە

"سەختگیری" کە بە زمانی عەرەبی و فارسی "تعصُب" و بە زمانە ئەوروپاییەکان "فەناتیزم"ی پێ دەڵێن؛ دیاردەیە (ظاهرة)یەکی کۆمەڵایەتییە کە لە ژیانی ڕۆژانەدا "واتەیەکی نەرێتی" (مفهوم سلبی) دەگەیەنێ. هەر کاتێك کە باسی "سەختگیری" بکرێ؛ خەڵکی "لایەنگیری و داکۆکییەکی بێ سنووروو بێ چەند و چۆن و بێ لێکۆڵینەوە و هوردکردنەوە"ی بیرێك یان ئاینێك یان کۆمەڵێکی سیاسی یان کەسایەتی (شخصیة)یەك دێتە بەرچاویان. سەختگیریی مرۆڤ لە لایەنگیری شتێکدا؛ بە زۆری، ئەوە پێشان دەدا کە ئەو کەسەی سەختگیرە، لە "کانی دڵییەوە" باوەڕی بە پایە بەرزی و بێ خەوشی و بێ هاوتایی و بێ گەردیی ئەو شتە هەیەو لەبەر ئەوەیە "دڵ"ی بەتەواوی بەو شتەدا چووە و "خۆشەویستی"ی خۆی پێشکێش کردووە. "دڵ چوون" بە شتێکدا و "خۆشویستنی"ی ئەو شتە، لەوانەیە "هەڵەو ناتەواوی و خەوش"ی ئەوشتە لەبەر چاوی مرۆڤ کاڵ بکاتەوە، و هەتا دڵ پێداچوون و "خۆشەویستی" بەهێزتربن؛ لەوانەیە هوردە هوردە چاوی ئەو کەسە لە ئاستی ناتەواوییەکانی ئەو شتەدا بەرەو "کوێری" بباو "هێزی بینایی"ی نەهێڵێ و بەمە سەختگیرییەکە بگاتە پلەی "سەختگیرییەکی کوێرانە" (التعصب الاعمی). ڕاستییەکەی هەموو سەختگیرییەك بۆ بیرێك (فەلسەفی رووت بێ، یان ئاینی)، لە بنچینەدا، لەسەر ئەوە بەندەکە ئەو سەختگیرە؛ ئەو بیرە بە "پیرۆز" (مقدس) و "نەتەکین" (مصُون) دەزانێ، واتە جۆرە خۆماڵ (خاصیة)ێکی ئێزدانی پێ ڕەوا دەبینێ؛ لەبەر ئەوەیە دڵی بڕوایی نادا هەڵمەت ببرێتە سەری و پەلاماری بدرێ. هەر لەبەر ئەمەشە وشەی ئینگلیزی fanatic (مُتعصب) لە وشەی لاتینی fanaticusەوە وەرگیراوە کە ماناکەی ئەوە دەگەیەنێ "کەسێك کە لە دەسەڵاتی خواییەتییەکەوە خرابێتە سەر پەلوپێ وشبر و شەیدا کرابێ"، و هەر لەمەشەوە وشەی Fanum پەیدا بووە کە بە مانای "جێیەکی پیرۆز" دێ کە کرابێ بە "شوێنی پەرستنی ئێزدان" واتە "پەرستگەی خودێ".

باوەڕکردنی مرۆڤێکی عاتیفی بە "پیرۆزی" و "بێ هاوتایی" و "بێگەردی"ی باوەڕێك بە جۆرێکی وا کە کاربکاتە سەر هەست و دەروون و گیانی ئەو مرۆڤە و لە دڵیدا شێتگیرانە جێی خۆی بکاتەوە؛ دەبێتە هۆی خڕداخستنی مێشکی ئەو مرۆڤە و سڕکردنی هێزی بیرکردنەوە و نەهێشتنی توانستی ڕەخنەگرتن

لەو باوەڕە و لایەنگرانی ئەوباوەڕەو هێندێ جاریش وا لەو کەسە دەکات کە هۆشی خۆی بە جارێ ون بکات و سۆزی دەروونی بگاتە هەندازەی سۆزی ئەو پەپوولەیەی کە لە شەوێکی تاریکی ئەنگوستە چاودا ئەوەندە بە دەوری تیشکی چرایەکی داگیرساودا دێتو دەچێ؛ تا باڵی خۆی بەجارێ دەسووتێنێ، یان وەك ئەو دەروێشەی لێ دەکات کە حاڵ دەیگرێ و خۆی دەداتە بەر زەرگ و خەنجەر و چەقۆ و باکیشی نییە.

هەموو سەختیگرییەکی ئاوا کوێرانە؛ بنچینەکەی "**هەر دڵ پێدا چوون و شبر و شەیدا بوون**"ە و لێرەدا "**بیرکردنەوە**" و "**هوردکردنەوە**" و "**توێژینەوە**" و "**مێشك گوشین**" هیچ دەورێك ناگێڕن. جا لە شوێنێکدا کە تەنێ "**هەستی دەروون**" و "**ئارەزووی دڵ**" و "**خۆشەویستیی رووت**" فەرمانڕەوابن؛ "**مێشك**" و "**هۆش**" لەو جێیە دەتۆرێن و باردەکەن و دۆ و دۆشاو تێکەڵ یەك دەبن و تەرازووی ژیربێژانە (منطقي) دەشکێ و لە ئەنجامدا "**راستی**" ون دەبێ.

بەڵێ لە تەڤگەری "**سەختگیریی کوێرانە**" دا "**راستی**" ون دەبێ. چۆنکە پەیدابوونی ئەم "**باوەر**"ە لەلای ئەو "**سەختگیرە کوێر**"ە لە ئەنجامی بیرکردنەوە و مێشك خستنە کارو لێکۆڵینەوە و بەراوردکردنی بیرە جۆرجۆرەکان و رەخنە لێ گرتن و تاوتۆکردنیانەوە پەیدا نەبووە؛ بەڵکو تەنێ کەفوکوڵی دڵ و دەروونە؛ لەبەر ئەوە ئەو کەسە؛ ئەو بیرە بە پارچەیەکی لە جیاکردنەوە نەهاتووی گیانی خۆی (نەك بیری خۆی) دەزانێ و وەك دایکێکی دڵ پڕبەزەیی چۆن زاڕۆی خۆی بەجگەرگۆشەی خۆی دەزانێ و هەزار هارە بەتانێ بکات؛ رێ نادات بە کەس بە خراپ نێوی ببات، یان پەنجەی تێوەر بدات، یان رەخنە بگرێ لێی، ئەوا ئەو سەختگیرە کوێرەش باوەڕەکەی خۆی بە کوڵ و دڵ دەوێ و رێ بە هیچ رەخنەیەك نادات لێی بگیرێ، و لەبەر ئەوەش "**ماف**" دەداتە دەست خۆی کە بەربەرەکانێی هەموو ئەوبیرانە بکات کە هی ئەو نین و بە "**ناڕاست**"یان دەزانێ، و هێندێ جاریش ئەم بەرەبەرکانێیە وا خەست دەکاتەوە تا دەیگەیەنێتە پلەی لەنێوبردنی ئەوانەی باوەڕیان بە باوەڕەکەی ئەو نییە، بێ ئەوەی دڵی بسووتێ پێیان، چۆنکە "**دڵی وی**" جێی گرتنی هیچ جۆرە شتێکی دی تێدا نەماوەتەوە، و مێشکیشی هیچ دەورێك نابینێ. ئەم جۆرە کەسانە مەترسییەکی گەورە پێك دێنن لە دژی ئازادیی کۆمەڵگە و بە زۆری دەبنە کوتەکی دەستی زۆرداران و ملهوڕانی زۆرزان و فێڵباز.

لێرەدا دەبێ بزانین کە "**سەختگیریی کوێرانە**" بە "**سەختگیریی کوێرانە**" نادرێتە قەڵەم لەبەر ئەوەی خاوەنەکەی، یان بە وتەیەکی دی دەروێشەکەی، هەر خۆی بە "**راست**" دەزانێ و "**راستی**"یەکەی خۆی بە رووت (مجرد) دەزانێ و دوای "**راستیی رووت**" (الحقیقة المجردة) دەکەوێ.

دواکەوتنی "**راستیی رووت**"ی بابەتانە لەگەڵ "**سەختگیریی کوێرانە**"دا بۆ سەرنجێکی لایەنگرانەی نابابەتانە، جیاوازن و یەك نین. چۆنکە "**راستی**" شتێك نی‌یە کە مرۆڤ بڵێ "**بەشێوەیەکی رووتی رێژەیی**" (بصورة مجردة نسبية) هەر نی‌یە، و هەموو کاتێك "**راستی**" هەر "**نسیبی**"یە: واتە تۆ بێیت بێژیت "**ئەوەی بەلای تۆوە راستە؛ دوور نی‌یە بەلای منەوە ناراستبێ؛ وئەوەی بەلای تۆ و منەوە ناراستە؛ دوور نی‌یە بەلای یەکێکی دی‌یەوە راست بێ**" و لەمە واتێ بگەیت کە "**راستیی رووت**" لە چاو (بەنیسبەت) هیچ بابەتێکدا و لە هیچ کوێ‌یەك و لە هیچ کاتێکدا هەر نی‌یە. نەخێر. مەسەلە وانی‌یە. کە تۆ و ئەز شتێك "**بەراست**" بزانین؛ مەرج نی‌یە "**ئەو شتە لە خۆیدا**" (الشئ في ذاته) "**نا راست**" بێ، یان ئەز و تۆ شتێك "**بە ناراست**" بزانین؛ مەرج نی‌یە "**ئەو شتە لە خۆیدا**" "**راست**" بێ.
"**راستی**" و "**ناراستی**"ی بیرێك یان سەرنجێك لە جێ‌یەکی تایبەتی و لە کاتێکی تایبەتی و لە هەلومەرجێکی تایبەتی‌دا؛ بە سەرنج یان باوەڕ یان هەڵوێستی من و تۆ (تەڤ یان دژ) دیاری ناکرێ و نایەتە گۆڕان. کە کراسێکی شین پێشانی کابرایەکی رەنگ کوێر (اعمى الالوان) بدەیت؛ رەنگەکە بە شین نایەتە بەرچاوی، بەلام سەرنجی ئەو کابرایە و چۆنێتی هاتنە بەرچاوی کراسەکە، رەنگی راستەقینەی کراسەکە ناگۆڕێ. خۆ ئەگەر کابرا گوتی رەنگی کراسەکە شین نی‌یە؛ ناتوانین بڵێین "**راست ناکا**". دەبێ بڵێین "**راست دەکا کراسەکە لای وی شین نی‌یە، بەلام "کراسەکە لە خۆیدا شینە**".

کە چەند بیرێکیش دێنە کایەوە لە کۆمەڵگەیەکی تایبەتی و لە کاتێکی تایبەتی و لە هەلومەرجێکی تایبەتی‌دا؛ دیارە هەر بیرێکیان لەلایەن لایەنگیرانی ئەو بیرەوە "**بەراست**" دەبینرێ؛ بەلام لەگەڵ ئەوەشدا و لە چاو بابەتی بیرەکەدا؛ یان هیچیان راست نین، یان هەریەکێکیان راستە، چۆنکە ئەگەر دووانیان یان زێتریان یان هەریەکەیان "**لە خۆیدا راست**" بێ، ئەوا نابنە دوو بیر یان چەند بیرێکی جیاوازی راست؛ بەڵکو دەبنە یەك بیری راست. ئەمجا "**بیر**"یش هەریەك سروشت (صفة) هەڵ دەگرێ؛ سا یان "ڕاست"ە یان "نا ڕاست"ە. چۆنکە ئەگەر بیرێك "**لە خۆیدا راست**" نەبوو یان "**لە خۆیدا ناراست**" نەبوو؛ دیارە دەبێ

لە هەمان کاتدا ئەو بیرە راستیش بێ ناراستیش بێ و ئەمەش ژێر بێژانە (منطقي) و بەجێ (معقول) نییە. بیر وەك مرۆڤی نێرەمووك نییە؛ دوو سروشتی جیاواز و دژ بەیەك هەڵ بگرێ.

جا وەك چۆن هەڵوێستی من و تۆ لە سروشتی "راستی و ناڕاستی"ی "**بیرێك لە خۆیدا**" لە "**کاتێکی تایبەتی و جێیەکی تایبەتی و لە هەلومەرجێکی تایبەتی**"دا ناگۆڕێ، هەروەهاش "**راستی و ناڕاستی**" و "**هەقێتی و ناهەقێتی**" بیرێك، یان سەرنجێك، یان رێ یەك؛ بە "**زۆروکەمی**" و "**ژمارەی لایەنگران و نەیاران**"ی ئەو بیرو سەرنج و رێیە نییە. هێندێك بیرو سەرنج و رێ هەن راستیشن و کەچی لایەنگرشیان یەکجار کەمە، و هێندێك بیرو سەرنج و رێش هەن کە ناڕاستیشن و کەچی لایەنگریشیان لە ژمارە نایەت.

"**بیری راست**" بەلای هاوبیرانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالزمەوە ئەو بیرەیە کە "**بابەتانە**" (موضوعي) بێ؛ واتە لە بابەتەکە (الموضوع) خۆیەوە هەڵ هێنجرابێ و هەڵقولابێ کە بەمەش دەڵێن "**بیری رەسەن**". "**بیری ناڕاست**"یش؛ ئەو بیرەیە کە "**بابەتانە**" نەبێ، واتە لە بابەتەکە خۆیەوە هەڵ نەهێنجرابێ و هەڵ نەقولابێ و بە کورتی "**بێگانە بێ بە بابەتەکە**"، کە بەمەش دەڵێن"**بیری ناڕەسەن**". جا لەم رووەوە هاوبیرانی ئەم قوتابخانە کوردییە دەبێژن: لەبەر ئەوەی ئێمە بیرەکەی خۆمانمان لە واقیعی بابەتەکەوە (واتە کۆمەڵگە کە)وە دەرهێناوە و بە (عاتیفە) وەرمان نەگرتووە. دیارە ئێمە کوێرانە دوای نەکەوتووین، بۆیە ئێمە بیری خۆمان لە چاو بابەتەکەدا "**بەڕاست**" دەزانین. هەروەها بیرەکانی دیکە کە نابابەتانەبن "**بەڕاست**" نازانین. چۆنکە ئەگەر ئەو بیرانەمان بەڕاست بزانیایە، دەبووینە لایەنگری یەکێك لەو بیرانە. ئەمجا لەبەر ئەوەی ئێمە ئەم رێیەی خۆمان بەڕاست دەزانین، دیارە رێ بەخۆمان دەدەین و "**هەق**" بە خۆمان رەوا دەبینین کە بۆ بیری خۆمان "**سەختگیر**" بین. مەبەستیشمان لەم "**سەختگیرییە**"ی خۆمان ئەوەیە، کە ئێمە سوورین لەسەر ئەوەی "**هەل و ماوە**"مان بە دەستەوە بێ تا بیری خۆمان ئازادانە دەربڕین و هاوبیرانی نوێ بدۆزینەوە بۆی و بیرەکەمان بخەینە مەیدانی کارەوەو کەسیش نەبێ رێ بگرێ لێمان. بەڵام ئەم سەختگیرییەی ئێمە "**کوێرانە**" نییە. چۆنکە وەك گوتمان ئێمە بە "**عاتیفە**" و "**هەوا و هەوەس**" و "**کەفوکوڵی دەروون**" ئەم رێیەمان نەگرتووە. ئێمە هاتووینەتە سەر ئەم راستییە لە ئەنجامی بەراورد کردن و لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوەو شی کردنەوەی کۆمەڵگەکەمانەوە بە

مێشکێکی بابەتانەی سەر بە واقیعەکە خۆی؛ بە هەموو درێژایی و پانایی و قووڵایی یەکی ژیاری (حیاتی)یەوە. دیارە ئەو ئەنجامەی لە دووای بیرکردنەوەیەکی سەر بەواقیعی بابەتەکە خۆیەوە وەرگیرابێ؛ سروشتی (طبیعي)یە و راستە، بە پێچەوانەی ئەو ئەنجامەوە کە لە دووای بیرکردنەوەیەکی سەر بە واقیعی بابەتەکە خۆیەوە وەرنەگیرابێ؛ کە دیارە ناسروشتی (غیر طبیعي) و ناڕاستە. لەبەر ئەوە کە ئێمە "**سەختگیر**"ین لە مەیدانی هەوڵداندا بۆ دەسکەوتنی ماف دەربڕینی ئازادانەی ئەو بیرەو پشتگیری کردنی؛ ئەوا ئەم <u>"**سەختگیری**"یەمان "**سەختگیرییەکی کوێرانە**" نییە؛ بەڵکو "**سەختگیرییەکی بینایانە**"یە.</u> بۆ وێنە ئەگەر هاتوو گوتت "هەموو گیان لەبەرێك پێویستی بە ئاوو هەتاوە بۆ ژیانی و لەسەر ئەم قسەیەت سۆر بوویت و سەختگیرانە هەڵت دایە لەسەری و لەبەرپەچ دانەوە و هەڕەشەو گوڕەشەی مرۆڤی نەزان و نەفام و ساویلکە نەترسایت و پاشگەز نەبوویتەوە و نەتگوت "**خەم ناکا! رەئی ئەوانەی دەڵێن ئاو و هەتاو بۆ هەموو گیان لەبەرێك پێویست نییە، ئەوەش هەر راستە**"؛ ئەوا سەختگیرییەکەت کوێرانە نییە؛ چۆنکە ئەوەی تۆ دەیڵێت "**راستی**"یەکە لە واقیعی سروشتەوە هاتووە و زانستانەیەو تاقی کراوەیە و لەبەر ئەوە سۆربوون لەسەری "**سەختگیری بینایانە**"یە. <u>زانستیش هەر بریتییە لە لایەنگیرییەکی بابەتانە.</u>

<u>بە کورتی باوەڕکردن بە بیرێکی بابەتانە و پشتگیری کردنی ئەو بیرە لە سنوورێکی بابەتانەدا؛ لەگەڵ "**سەختگیریی کوێرانە**" جیاوازە.</u> چۆنکە مرۆڤ ئەگەر باوەڕی بەکارێك نەبێ، بە ئارەزووی دڵی خۆی دەست ناکا پێی. ئەو خوێندکارەی دەست دەکات بە خوێندنی ماتماتیك؛ باوەڕی بەوە هەیە کە دەتوانێ ماتماتیك بخوێنێ؛ خۆ ئەگەر بزانی سەتی سەت سەرناگرێ بۆی، دیارە دەست ناکات بە خوێندنی. ئەوانەی هەزاران جۆر دەرمانی سەیر سەیر و داهێنراوی وەك فڕۆکە و تەلەفۆن و رادوێ و ئەمانەیان دروست کردووە، و هەزاران کەس گاڵتەیان کردووە پێیان؛ کەچی هەر لەسەر کاری خۆیان بەردەوام بوون؛ هۆی ئەوە بووە کە باوەڕیان بەراستیی رێی خۆیان و ناڕاستیی رێی ئەوانی دی بووە. ئەگەنا هەر زوو پشتیان ساردەبووەوە وازیان دەهێنا. کەواتە باوەڕکردنی بابەتانەو زانستانەو ژیرانە لەگەڵ باوەڕکردنی نازانستانە و نابابەتانەو ناژیرانە جیاوازە. لەبەر ئەوە ئەوانەی دەڵێن هەموو باوەڕێك هەر "**رێژەیی**"یەو دەکەونە سەفسەتەکاری و؛ لەسەر هەق نین. ئەو کەسەی کە رۆژێ

لە رۆژان پێی وابووە دەتوانێ پارچە ئاسنێك ببات بە ئاسماندا و بیکا بە فڕۆکە؛ دەرکەوت کە بیری ئەو ڕاست بوو؛ نەك بیری هەزاران کە باوەڕیان وابووە ئاسن نابرێ بە ئاسماندا. لەمەدا وادەردەکەوێ کە هیچ کارێك بەبێ بوونی باوەڕکردن بەو کارە و ئەنجامی ئەو کارە و پشتگیریی ئەو کارە ناچێتە سەر. ئەگەر ویستت لە کارێکدا سەربکەوی دەبێ لە بنچینەوە باوەڕێکی بابەتانەت بەو کارە هەبێ. کە ئێمە بەو باوەڕە بابەتانەیە دەڵێین **"سەختگیریی بینایانە"** (التعصب الواعی).

لەبەر ئەوە کە ئێمە دەڵێین **"کۆمەڵگەی ئادەمزاد دەبێ ئازادو یەکسان بێ"** و سەختگیرانە لەسەر ئەو ڕەئیی‌یە سوورین و لێی پاشگەز نابینەوە، ئەوا ئەم سەختگیری‌یەمان کوێرانە نی‌یە؛ بەڵکو بینایانەیە. چۆنکە ئەگەر **"بیرێکی دیکە"**ش هەر بەڕاست بزانین و ئەم **"بیرەی خۆمان"** شلو شۆڵ بگرین؛ مانای وایە **"نا ئازادی و نایەکسانیی کۆمەڵگە"**ش هەر بەڕاست دەزانین، و ئەمەش دیارە دژی **"سروشتی مرۆڤایەتی"** و **"مافی مرۆڤایەتی"**یە. لەبەر ئەوە ئێمە جارێکی دیش دووپاتی دەکەینەوە بەم سەختگیری‌یەی خۆمان دەڵێین **"سەختیگریی بینایانە"**.
ئەمەی لە سەرەوە باسکرا ئەوە دەگەیەنێ کە ئێمە **"ڕاستی و ناڕاستی"**ی **"بیرێك لە خۆی دا"** بە دۆخێك (وضعية) دەزانین کە پێوەندیی بە دیوی نێوەوەی بابەتی سەرچاوەی ئەو بیرەوە هەبێ؛ نەك بەدیوی دەرەوەی. جا چۆن هەر شتێك کە بریسکەی لێوە هات زێڕ نی‌یە، هەموو بیرێکیش کە وشەدار دەرکەوت و قەڵەباڵغی لەدەوروپشت کۆبووە؛ ڕاست نی‌یە. هەر بیرێکیش کە جوان و دوورکوژ دیار نەبوو، یان خەڵکێکی زۆر لە دەوری کۆ نەبوو؛ مانای وانی‌یە کە ناڕاستە. **"بیری ڕاست"** واتە **"بیری ڕەسەن"**، وەك زێڕی تێزاب و ایە؛ فڕێش بدرێتە قوڕەوە و دەرەکەشی ژەنگی هەڵ هێنابێ، لە زێڕێتیی خۆی هەر ناکەوێ. **"بیری نا ڕاستیش"**؛ واتە **"بیری نا ڕەسەن"**، وەك مسێکی ژەنگ گرتووی زاخاو دراو وایە، هەر توێکێکی لێ لاچوو، ڕەشی دەردەکەوێ. لەبەر ئەوەی ئێمە پێمان وایە کە **"بیری نا ڕاست"** ناتوانێ هەتا سەر لە مەیدانی پێشبڕکەو بۆڕ بۆڕێندا سەر بکەوێ و بەرگەی **"بیری ڕاست"** ناگرێ. واتە ئێمە لەو باوەڕەداین کە **"بیری ڕاست"** هەر سەردەکەوێ، شتێکە سەرکەوتنەکەی درەنگ و زوویی کەوتووە، بەمەرجێ ڕێی بدرێ ئازادانە بچێتە مەیدانی دەنگ دەربڕین و خستنە کارەوە.

جا هەر لەبەر ئەوەشە کە ئێمە لە هیچ "**بیرێکی ناڕاست**" سڵ ناکەینەوە و ناترسین و ڕێزی هەموو بیرێك دەگرین و لە ڕەخنە لێ گرتن و شی کردنەوە بەولاوە؛ بە هیچ جۆرێك پەلاماری خۆی و لایەنگیرانی نادەین چۆنکە دەزانین ئەو بیرە ناڕاستە نارەسەنە، ڕۆژێ لە ڕۆژان جێی خۆی لە کۆمەڵگەدا بۆ بیروباوەڕی ڕاست و ڕەسەنی ئێمە چۆڵ دەکات. هەر لەمەشەوەیە کە ئێمە باوەڕمان بە بەکارهێنانی "زۆر" نییە دژی ئەو بیروباوەڕانەی کە وەك بیروباوەڕی ئێمە نین و بەم پێیە ئێمە هەمیشە لەبەرەی ئاشتیخوازانی ڕاستەقینەداین.

جا بۆ ئەوەی "**سەختگیریی کوێرانە**" دەسەڵاتی ئەوەی نەمێنێ هەتا سەر کۆمەڵگەی ئادەمزاد دیل و ژێردەستە بکات، بوون و پاراستنی "**سەختگیریی بینایانە**" زۆر پێویستە، ئەمجا بۆ ئەوەی "**سەختگیریی بینایانە**" بەسەر "**سەختگیریی کوێرانە**"دا سەرکەوێ؛ "**ئازادیی دەربڕینی بیروباوەڕ**" و "**بوونی کات**" زۆر پێویستن، تا "**بیری ڕاستی ڕەسەن**" بتوانێ جێ بە "**بیری ناڕاستی نارەسەن**" لێژ بکات. هەر لەبەر ئەوەشە هەڵگرانی بیری ناڕاست ڕێ لە دەربڕینی ئازادانەی دەنگی بیرو باوەڕی ڕەسەنی ڕاست دەترسن، و ڕێ لە ئازادانە هاتنە مەیدانی هەڵگرانی بیری ڕەسەنی ڕاست دەگرن و گەلێك جار لە ڕێی بەکارهێنانی زۆر و دەست وەشاندن و خوێن ڕشتن و دژ بیر لە نێوبردنەوە؛ بیری ڕاستی ڕەسەن تاماوە یەك دەمکوت دەکەن و ئەم کردەوەیەشیان، لە بنەڕەتدا؛ لە ترسەوە دێ، و بۆیەش وادەکەن تاکو بیری ڕاست لە نێو کۆمەڵگەدا ماوەی جووڵانەوەو کارکردنی نەبێ و بەجەماوەرەوە پێوەندیی نەمێنێ و نە پەرژێتە سەر ئەوەی گەرابخات و هەر زوو لە نێو ببرێ و تەفرو توونا بکرێ. بۆ ئەمەش بیری ڕاست پێویستی بەوەیە هەلو مەرج و بارودۆخێك دروست بکات کە بتوانێ لە ژێر باڵی ئاسایشدا بە ئازادی بکەوێتە کار، بە جۆرێ ئەوانەی سەر بە بەرەی سەختگیریی کوێرانەن؛ پێیان نەکرێ دەست درێژی بکەن و دەست بوەشێنن. هەرچی لایەنگرانی بەرەی سەختگیریی کوێرانەشن؛ ئەوا بۆ سەپاندنی بیری ناڕاستی نارەسەنی خۆیان بەسەر کۆمەڵگەدا؛ دەیانەوێ "ئازادی" بە تەنیا بخەنە دەست خۆیان و ڕێی ئازادی لە کۆمەڵگە (مجتمع) بگرن و لە ڕێی بەکارهێنانی زۆر و ترساندن و لێدان و کوشتن و بڕینەوە خۆیان بە زۆری زۆردارەکی بەسەر گەلدا بسەپێنن. هەر لەبەر ئەوەشە ئەمانە هەموو کاتێك لەبەرەی شەڕخوازان و دەست وەشێنەران و فاشیست و دیکتاتۆر و ملهوڕان و درۆزناندا دەبینرێن. جا وەك گوتمان؛ ئەم

دەست وەشاندن و خەڵك تۆقاندنەشیان هەر لە ترسەوە دێ. واتە لە ترسی بەرەنگاربوونیان لەگەڵ بیروباوەڕی راستی رەسەن و کۆتایی هاتنیان بەنابووتی، لەبەر ئەوە، ژیانی خۆیان لە نەمانی خەڵکی دیدا دەبینن، بۆیە لە لەنێوبردنی هەموو رەخنەگرێك و بەرهەڵستکەرێك ناسڵەمێنەوە و ناپرنگێنەوە..

هەروەها هاوبیرانی ئەم قوتابخانە کوردییە دیسانەوە دەبێژن: (ئەمڕۆ دوو لەشکرگە بەرامبەر یەك وەستاون؛ یەکەمیان: لەشکرگەی سەختگیریی کوێرانەیە کە چەکی دەستی بریتییە لە هەڕەشە و گوڕەشە و درۆ و دەلەسە و دەستبڕینی ساویلکە و خوێنڕشتنی بێگوناهان و خۆبەستن بە ملهوڕو داگیرکەران و دوژمنانی گەلانی ژێردەستەوە و؛ بەم جۆرە دەیەوێ جێی خۆی لە کۆمەڵگەدا بکاتەوە و هەموو تروسکەیەکی ئازادیی بیروباوەڕ و سەرنج دەرخستن و رادەربڕین بکوژێنێتەوە، و خۆی بکاتە میری سەربڕ و کەڵەگای کۆمەڵگە و دووەمیشیان: لەشکرگەی سەختگیریی بینایانەیە؛ کە دەیەوێ لە رێی دابین کردن (اقناع) و پێ سەلماندن و وتووێژ و رەخنەگرتن و لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوە و نموونە پێشاندانەوە بە ئاشتییانە بەڵام پێ داگرانەو کۆڵ نەدەرانە کاری خۆی بکا و جێ بە سەختگیریی کوێرانە لێژبکات و شوێنی خۆی لە کۆمەڵگەدا بکاتەوە).

<u>ئەمجا ئێستە ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ: ئایا ئەوانەی دەڵێن **"ئێمە بابەتانە و زانستانە بیردەکەینە"** و **"داوای ئازادی دەکەین بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی"**، دەبێ جێی خۆیان لە کام لەشکرگەدا بدۆزنەوە؟</u>

با خۆیان وەرامی ئەم پرسیارە بدەنەوە.

# بێ لایەنی لە نێوان لانەگرتنی بابەتانە و بێ هەڵوێستیی هەلپەرستانەدا
# -زانست هەڵوێستە

لە ژیانی رۆژانەدا، زۆر کەس دەبینین کە خۆیان "**بێ لایـەن**" دەدەنە قەڵـەم؛ بێ‌لایـەن بەرامبـەر هـەموو، یـان هێندێـك لـە رووداوەکـانی جیـهان، هـەر لـە رووداوێکی گچکەوە بیگرە هەتا دەگاتە کارەساتێکی یەکجار مەزن. ئەمانە لە بارەی ئەو رووداوانەوە، یان هێندێك لەو رووداوانـەوە، هیچ رایـەك دەرنـابڕن، و پاکانە کردنیشیان بۆ خۆیان ئەوەیە، گوایە نایانەوێ "**حیزبایـەتی**" بکەن، یان ببنە پێبەندی هیچ جۆرە "**کۆمەڵەیەکی تایبەتی**"، یان "**رێبازێکی سیاسیی دیـاری کـراو**"، و بەمەش دەیانـەوێ بـاری سەرشـانی خۆیـان سـووك بکەن و خۆیـان لووسوبارێك لە بواری بەرپرسیاری بپەڕێننەوە. زۆریش لەمانە پێیان وایە "**بێ لایەن وەستان**" بەرامبەر بە دووبیری لە یەك نەچوو، یان دووکرداری جیاواز، یان دوو سیستەمی پێچەوانە بە یەك، مانای "**زانستانە وەسـتان**"ە بەرامبـەر بەو دوو بـیرو کـردار و سیسـتەمە. چۆنکـە لایـەنگیری بەلایـەنی وانـەوە، لـە هـەموو دۆخێکدا، هـەر "**حیزبایـەتی**"و "**بـەرچاو تـــەنگی**" دەگەیـەنێ، و ئەمـەش بـە هەڵوێستێکی "**نازانستانە**" دەزانن..

لێرەدا دەبێ جارێ دووشتی بنچینەیی لەیەك جیابکەینەوە؛ واتە: "**سەرەتای دەست پێ کردن بە لانەگرتنی بابەتـانە**" لەگەڵ "**مانەوەی تاسەر بەبێ لایـەنیی بـێ هەڵوێستانە**" نەکەین بەیەك شت. بێگومان، ئەو کەسەی دێ و سەرنج دەدات لە دوو بیری جیاوازی دەربڕاو بەرامبـەر بە رووداوێك، لـە شـوێنێکی تایبـەتی و کاتێکی تایبەتی‌دا، ئەوا، ئەگەر ویستی سەرنجەکەی بابەتانە بێ، دەبـێ بەر لـە هـەموو شـتێك؛ هـەر لـە پێشـەوە و لەبـەر بـوورە؛ خـۆی نـەکات بـە خـاوەنی یەکێکیان، بەڵکو لـە هەر دوو بیرەکە بە یـەك چـاوبنوارێ و بەیـەك "**سـەنگ و تـەرازوو**" هـەردووکیان بکێشـێ، کە ئـەو سەنگ و تـەرازووەش دەبـێ سـەنگ و تەرازوویەکی "**ئازادی مرۆڤ دۆسـتانە**" بـێ، واتـە تەرازوویـەك بێ؛ کە "**ئـازادیی مـرۆڤ**"ی کردبێتـە "**پێوانــە**"ی خـۆی، و لـە پێشـەوە بەلای هیـچ کامێکیـاندا دانەتاشێ، هەتا هەردووکیان بە تەواوی شی دەکاتەوە، و بێ لایەنگری، لەگەڵ یەك بەراوردیان دەکات، بەپێی ئەو شوێن و کاتە تایبەتی‌یە. بەڵام ئـەو کەسەی

ئەم کارە دەکات، وەك گوتمان، دەبێ "سەنگ و تەرازوو"یەکی هەبێ، ئەوجا بکەوێتە کار، چۆنکە بەبێ "سەنگ و تەرازوو" هیچ شتێك ناپێورێ. ئەمجا ئەو کەسەی ئەم کارە دەکات، بۆیەکی دەکات کە بگاتە ئەنجامێك، خۆ ئەگەر مەبەست گەیشتنە ئەنجامێك نەبێ، ئەوا هەموو زەحمەتکێشان و خۆخەریك کردنێك بێ سووت و کات بە فیڕۆدانە. بەڵام هەر کە ئەنجامەکە بەو شێوازەی سەرەوە کەوتە دەست، مانای وایە قورسی و سووکی و خۆماڵە تایبەتی‌یەکانی دیکەی هەردوولا؛ دەرکەوتووە، و ئەمەش لێکۆڵەرەوە ناچار دەکات کە رایەك دەربڕی بەرامبەریان. خۆ ئەگەر هیچ رایەك دەرنەبڕێ، ئەوا دیارە لەبەر پرسیاری رادەکات. هەموو راکردوویەکیش لەبەر پرسیاری، هەلپەرستە و ترسنۆك. لەبەر ئەوە مرۆڤی بەرپرسیار دەبێ خاوەن بیروڕابێ، ئەوجا ئەو بیروڕایە بە سووتی چ لایەك دەبێ، ئەوە مەسەلەیەکی دی‌یە و گرنگ نی‌یە. گرنگ ئەوەیە رایەکە بابەتانە بووە. جا ئەو کەسەی کە ئەم را بابەتانەیە دەردەبڕێ، ئەوا بەو کردەوەیەی خۆی، بیەوێ و نەیەوێ، لایەنێك دەگرێ. مەرجیش نی‌یە ئەو لایەن گرتنەی بە سووتی هیچ بەرەیەك لەو بەرانە بێ کە لە مەیدان دان. سروشتی مرۆڤی زانستکار (عالم) ئەوەیە، ئەو لایەنەی کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی بابەتانەدا، لە شوێن و کاتێکی تایبەتی‌دا، راست دەرکەوتووە؛ دەست بەجێ بیکاتە لایەنی خۆی و دەست بدات بە مێزدا بۆی. جا کە ئەوەشی کرد، ئەوا ئەو کەسە، خۆشی بێ و ترشی بێ، لایەنگرە، چۆنکە "هەموو هەڵوێستێك لایەنگری‌یە" جا لەبەر ئەوەی زانست بریتی‌یە لە هەڵوێستێکی بابەتانە، دیارە هەموو مرۆڤێکی بێ هەڵوێست، نازانستانە دەکەوێتە کردار. هەموو بێ هەڵوێستی‌یەکیش ئەنجامی "بێلایەنی"یە. کەواتە "مرۆڤی بێلایەن"؛ بەشێوەیەکی نازانستانە بیردەکاتەوەو نازانستانەش دەکەوێتە کار.

زاناو بیرکەرەوەکانی بەرەی سەر بە جیهانی سەرمایەداریی ئەهلی "گەورە بۆرژوا و هوردە بۆرژوا"، واتە گوایە "جیهانی ئازاد"، لاف ئەوە لێ دەدەن کە "زانست بێلایەن"ە، و "زانست دەبێ بێلایەن" بێ. هەروەها دەبێژن: لاگرتن، لەسەرەتاوە، دژی مێتۆدی زانستانەی بابەتانەیە. ئەم قسەیە تا ئێرە هێندێك راستیی تێدایە، بەتایبەتی ئەوەی کە دەبێژێ "لاگرتن، لەسەرەتاوە، دژی مێتودی زانستانەی بابەتانەیە". بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە "لانەگرتن لەسەرەتاوە" مانای "بێ سەنگ و تەرازوویی" نی‌یە، و "لاگرتنیش لەسەرەتاوە" نابێ بکرێتە

سەرپۆشێك بۆ شاردنەوەی لاگیریی خۆ بە هەڵبژاردنی سەنگ و تەرازوویەك بە نێو "ئازاد"؛ بەڵام بە کردەوە دژی مافی ئازادیی مرۆڤ و دژی مافی یەکسانیی مرۆڤ، بە بیانووی "**مێتۆدی زانستانە**"ەوە. چۆنکە زانست خۆی بەشێکە لە بیرکردنەوەی ئادەمزاد و بەرهەمی بیرکردنەوەی ئادەمزادە، و دەبێ هەر لە خزمەتی ئازادیی ئادەمزاد دابێ، و لێکۆڵینەوەی زانستانەش دەبێ بە تەرازوویەکی ئازاد بێ و تەرازووی ئازادیش ئەوەیە کە دژی ئازادی نەبێ و هەموو قورسی و سووکییەکیش هەر بە پێوانەی ئازادیی مرۆڤ بکێشێ، و ئەوەش ئەنجامەکەی لە کۆتاییدا بە هەڵوێستێك تەواو دەبێ؛ کە مەسەلەی بێ لایەنیی زانست، بەمانای نەبوونی پێوانە لەسەرەتاوە، بە تەواوی بە درۆدەخاتەوە.

ئەمەوا، و هەرچی مارکسیستەکانیشن، ئەوا بە پێڕەوی کردنی سەرنجی "**مەتریالیزمی دیالەکتیکی**"ی خۆیان، کە دێنە سەر باسی زانست، پێیان وایە کە زانست بە شێوەیەکی بێلایەن نەبووەو نییە، بەڵکو زانست هەر لەسەرەتاوەو بە هەموو جۆرە لکەکانییەوە لایەنگرە و بریتییە لەلایەنگری. ئەمەشیان تائێرە راستە، بەڵام ئەوە هەیە ئەوان مەبەستیان لەلایەنگری، هەر لایەنگریی چینایەتییەو بەس، واتە بەلای وانەوە، زانستی سەر بە چینی دەرەبەگ هەیە، و زانستی سەر بە چینی بۆرژوا هەیە، و زانستی سەر بە چینی پرۆلیتاریا هەیەو..هتد. زانستێك کە هەر "**مرۆڤ دۆستانە**" بێ و سەر بە هیچ چینێکی تایبەتی نەبێ، ئەوە هەر نییە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەبێژن "**راستیی تەواو**" وا بەلای "**چینی پرۆلیتاریا**"وە، چۆنکە تەنێ چینی پرۆلیتاریایە کە بەرژەوەندیی لە "**بێ چین کردنی کۆمەڵگە**"دا هەیە. جا ئەگەر ئێمە لێرەدا مافی ئەوەیان نەدەینێ کە ئەوان زانست لە بنەڕەتەوە بەشتێکی چینایەتی بزانن، و لەباری سەرنجی چینێکەوە دەست پێ بکەن، و هەر لەسەرەتاوە بە سەنگ و تەرازووی ئەو چینە بکەونە پێوان، ئەوا دەبێ مافی ئەوەیان پێ بدەین، کە لەوەدا راست دەکەن، کاتێك "**زانست بە هەڵوێستێك**" دەزانن، ئەگەرچی لە مێتۆدی لێکۆڵینەوەیاندا بۆ گەیشتنە ئەو هەڵوێستە، بە "**شێوەیەکی نابابەتانە**" دەکەونە کار. چۆنکە زانست راستە هەڵوێستە، بەڵام هەڵوێستێکی بابەتانەیە. بۆ گەیشتنە ئەو هەڵوێستە بابەتانەیەش دەبێ لێکۆڵەرەوە لەسەرەتاوە بە سەنگ و تەرازووی لەوە پێش دروستکراوی هیچ چین و دەستە و کۆمەڵەیەك نەکەوێتە کێشانی بابەتەکە، بەڵکو بە سەنگ و تەرازوویەکی ئازاد بکەوێتە کار،

تا دەگاتە ئەنجام. سەنگ و تەرازوویەکیش کاتێك ئازاد دەبێ؛ کە یەکسانیی چینایەتیی ئابووری و رۆشنبیریی کردبێتە پێوانەی خۆی و هەر لەوەشەوە دەست پێ بکات. ئەمە لە کاتێکدا کە مارکسیستەکان باوەڕیان بەم سەنگ و تەرازووە ئازادە نی یە، و لە سەنگ و تەرازوویەکی لەوە پێش ئامادەکراوی بەپێی لێکدانەوەی خۆیان- سەر بە **"چینی پرۆلیتاریا"** واتە؛ سەر بە چینێکی تایبەتی یەوە، دێنە پێشەوە، کە ئەوەش **"نا بابەتیی مێتۆدەکەیان"** دیاری دەکات. چۆنکە مارکسیستەکان ئەوە لە بیر خۆیان دەبنەوە کە **"چینی پرۆلیتاریا"**، هەر ئەوەندە **"چینی پرۆلیتاریا"**یە؛ تا پێ خوستی سەرمایەو چەوساوەی دەستی سەرمایەدارە. بەڵام کاتێك کە **"چینی پرۆلیتاریا"** شۆرشی کرد و دەزگەی فەرمانڕەواییی چینی سەرمایەداری شکاند و خۆی دەسەڵاتی گرتە دەست، ئەو دەمە لە **"چینی پرۆلیتارایاییی ژێردەستە و بەشخوراو دەردەچێ"**، و دەبێتە **"فەرمانڕەوا"** و **"نان بەدەست"** و خاوەن دەزگەی **"دەسەڵات"** و تەنانەت **"دیکتاتۆر"** وەك مارکسیستەکان خۆیان دەبێژن - ئەوجا زۆر زەحمەت دێتە بەرچاو، کە ئەوانەی بە نێوی ئەم چینەوە قسە دەکەن و هاتوونەتە سەرکار، بە ئارەزووی خۆیان، واز لە **"دەســـەڵات"** و **"فـەرمانڕەوایی"**ی خۆیان بهێنن و کۆمەڵگە بکەن بە **"کۆمەڵگەیەکی بێ چین"**، واتە؛ ئەو دەسەڵاتەی هەیانە بەشی بکەن لە نێو هەمووواندا!

بەڵام ئەوانەی سەر بە **"بیرو قوتابخانەی ئازادی و یەکسانین"**، ئەوا ئەمانە جارێ ناتوانن **"بێ هەڵوێست"** بوەستن بەرامبەر هیچ رووداوێك، بەنێوی **"بێلایەنییەوە"**، چۆنکە ئەوانەی سەر بە **"بەرەی ئازادی و یەکسانیی مرۆڤ"**ن، لەو باوەڕەدان کە مەسەلەی مرۆڤایەتی؛ یەکەیەکی لە پسان نەهاتووی کەرت نەکراوە، و دەشزانن کە **"بێ لایەنی"**، چ لەسەرەتاو چ لە بنەتادا، درۆیەکی زەقەو هیچی دی، لەبەر ئەوە **"بێ هەڵوێستی"** بە **"هەلپەرستی"** دەزانن، و بۆ گەیشتنە هەڵوێستی خۆشیان لە **"سەنگ و تەرازووی ئازادیی مرۆڤ و یەکسانیی مرۆڤ"**ەوە دێنە دەرەوە. ئەم سەنگ و تەرازووەش، لە بنەڕەتەوە، سەنگ و تەرازوویەکی حیزبایەتی یان چینایەتی یان دەستایەتی یان بنەماڵەیەتی یان هۆزایەتی نی یە، یا رێکخراوێك، یا چەند رێکخراوێکی تایبەتیش هەبن؛ کە ئەم سەنگ و تەرازووەیان کردبێ بە دەستاوێژی مێتۆدی لێکۆڵینەوەی خۆیان، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوە لە بنەمای مەسەلەکە ناگۆڕێ. مەسەلەی ئازادیی مرۆڤ و یەکسانیی مرۆڤ، نە شتێکی چینایەتی یەو نە دەستەیەتی و نە بنەماڵەیەتی و

نـه هۆزایـەتی، و نـە حیزبایەتیشـە بـە مانـای تـەنگی خۆبـەخۆیی. بـەڵکو "**حیزبایـەتی**"یەکە بەمانای "**لایـەنگری یـەکی بابەتانـە**" و بە پێـی سـەنگ و تەرازوویەکی "**مرۆڤ دۆسـتانە**" و سـەرنجێکی "**ئـازادانـەی یەکسـانانە**" و هیچی دی.

ئەمجا با وێنەیەك لەسەر ئەم بهێنینەوە:

ئەمە چەند سـاڵێکە، وڵاتێکـی بـە ژمـارەی دانیشـتووان گچکـەی، لـەبارەی پیشەسـازی‌یەوە دوواکـەوتووی، وەك ئەفغانسـتان، لەلایـەن زلهـێزێکی بەدەسەڵاتی وەك "**یەکێتیی سۆڤێت**"ەوە بە لەشکرەوە پەلاماردراوە، و بەشێکی خەڵکەکەی ئەفغانستان بە چەکەوە راست بووەتـەوە دژی ئـەم زلهێزە و بووەتـە شەڕو بەیەکادان و لەمەشەوە دوو هەڵوێستی سەرەکی دژ بە یەك لـە جیهاندا دروست بوون:

(١)-هەڵوێسـتێك کـە هەڵوێسـتی یـەکێتیی سـۆڤێت و بـەرەی رۆژهـەڵات و کۆمۆنیسـتەکانی سـەر بـە هێڵـی مۆسـکۆیە. ئەمانـە دەبێـژن: حکوومـەتی ئەفغانسـتان خـۆی داوای لـە لەشـکری سـۆڤێتی کـردووە، بـۆ ئـەوەی بـەپێی پەیمانێکی "**هاوڕێیەتی و یارمەتی**" کە لە نێوان ئەفغانستان و سۆڤێتدا هەیە، یارمـەتیی ئەفغانسـتان بدات و لەشـکری سـۆڤێت بـە رەزامـەندیی حکوومـەتی ئەفغانسـتان ئەمـەی کـردووە و لەبـەر خـاتری گـەلی ئەفغانسـتان، کـە لەلایـەن "**کۆنە پەرستان**" و "**نۆکەرانی ئیمپریالیزم**"ەوە هەڕەشە دەکرێ لێی.

(٢)-هەڵوێسـتێکی دی کـە هەڵوێسـتی فـەرمانڕەوایانی وڵاتـە سـەرمایەدارەکانی سـەر بـە بـەرەی رۆژاوایـە. ئەمانـە دەبێـژن: سـۆڤێت وڵاتـی ئەفغانسـتانی بە زۆر داگیرکردووە و هێزێکی دەست درێژکـەرە و دەبێ بچێتـە دەرەوە و گەلی ئەفغانستان دژی داگیرکەرانی وڵاتەکەیەتی.

جا ئەگەر سەرنجی هەڵوێستی یەکەم بدەین، دەبینین ئەفغانستان ئـەندامی "**کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان**"ە و حکوومەتی کامیل بەبرەك بە رەسمی لەلایەن تـەواوی دەوڵەتـەکانی جیهانەوە ناسـراوە. ئەفغانستان دەمێکە لەگـەڵ سـۆڤێت پەیمانی "**هاوڕێیـەتی و یارمـەتی**" بەسـتووە، و ئـەوەش راسـتە کـە حکوومـەتی بەبرەك داوای لـە سـۆڤێت کـردووە لەشـکر بکێشـێتە ئەفغانسـتان. خـۆ ئەگـەر سـەرنجی هەڵوێسـتی دووەم بدەیـن، دەبینیـن حکوومـەتی بـەبرەك حکوومـەتێك نی‌یە کە لەلایەن گەلی ئەفغانەوە هەڵ بژێررابێ، بەڵکو لەرێی کودەتاوە هاتووەتە سەرکارو، ئەو "**رەوایەتی‌یـە قـانوونی**"یـەی نی‌یە کە بە نێـوی "**گـەل**"ەوە داوا

بكات رژێمەکەی بپارێزرێ. لەبەر ئەوە سۆڤێت مافی ئەوەی نی‌یە، بچێ بەقسەی رژێمێکی ناشەرعی دیکتاتۆر، سوپا بنێرێتە سەر ئەفغانستان، و لەبەر ئەوە سۆڤێت داگیرکەرە، و ئەم قسەیەش هەر راستە.

کەواتە، هەردوولا، هەر یەکەیان بەپێی سەنگ و تەرازووی خۆی، هەقی هەیە و قسەکەشی راستە و بەڵگەکەی بەجێ‌یە.

ئەمجا با ئێمە لێرەدا واز لەوە بهێنین کە بەرەی رۆژاوا، ئەمڕۆ حکوومەتی کامل بەبرەك بەشەرعی نازانێ، سەبارەت بەوە نی‌یە کە بەبرەك لەرێی کودەتاوە هاتووەتە سەرکارو بەهۆی هەڵبژاردنەوە نەبووەتە فەرمانڕەوا. راستی‌یەکەی ئەم هەڵوێستەی بەرەی رۆژاوا بە پێی سەنگ و تەرازووی بەرژەوەندیی خۆیەتی، نەك بەپێی تەرازوویەکی **"بێ لایەنانە"** چۆنکە ئەوەتە هەر ئەو بەرەی رۆژئاوایەیە؛ دۆست و هاوپەیمانی گەلێك لەو دیکتاتۆرە خوێنڕێژانەیە کە بە کودەتا هاتوونەتە سەرکار و گەل هەڵی نەبژاردوون، وەك ئێڤرەنی ترکیا و سەددامی عێراق و پینۆشێی و کێ و کێ. هەروەها با لەوەش بگەڕێین کە هاتنی لەشکری سۆڤێت بۆ ئەفغانستان بە **"داگیرکردنی ئەفغانستان"** دادەنێ، کەچی ئەوەتا لەشکری ترکیا دەکشێ بەسەر خوارووی کوردستان (کوردستانی عێراق)دا و بەرەی رۆژاوا نقەی لێوە نایەت، کە قسەش بکەیت دەبێژن **"حکوومەتی عێراق خۆی داوای یارمەتی لە ترکیا کردووە"**، و لەم رووەوە باسی ئەو پەیمانە دەکەن کە لە ساڵی ١٩٧٨دا لە نێوان عێراق و ترکیادا بەستراوە. بە کورتی؛ دەچن هەر ئەو بەڵگەیە بەکار دەهێنن کە لایەنگرەکانی سیاسەتی مۆسکۆ بۆ پاساوی پەلاماری سۆڤێت بۆ سەر ئەفغانستان، بەکاری دەهێنن، بەڵام بۆ پشتگریی هاوپەیمانەکانی خۆیان، نەك بۆ پشتگریی سۆڤێت کە هاوپەیمانیان نی‌یە. لەگەڵ ئەوەشدا، باس کردنی ئەم شتانە بۆ ئێمە زۆر گرنگ نین، و ئەم لایەنگری‌یەی هەردوولا، هەریەکە بە پێی بەرژەوەندیی خۆی، لە هەموو جیهاندا دەرکەوتووە، و ئێمە پێویستمان بە بەڵگەی پتر نی‌یە بۆ ئەمە. بەڵام ئەوەی بەلامانەوە گرنگە ئەمەی خوارەوەیە:

ئایە، ئەگەر هاتوو دیکتاتۆرێك یان ملهوڕێك بەرەئی زۆربەی زۆری گەلێك، یان تەواوی ئەو گەلە هەڵبژێردرا، ئایە ئەو دەمە **"رەوایەتی"** (الشرعیة) دەدرێ بە فەرمانڕەواییی ئەو دیکتاتۆرە یان ئەو ملهوڕە؟

یـان، ئەگـەر گـەلێك بـە ئـارەزووی خـۆی ڕژێمێكـی تۆتـالیتێری بـۆ خـۆی هەڵبژارد، ئایە دەبێ ڕێزی ئەو بڕیارەی بگیرێ، و بگوترێ هـەموو گەلێك مـافی سەرەوەریێتی (سیادة)ی هەیە؟

ئێمە ئەم پرسیارە دەکەین و بەلامانەوە گرنگە، چۆنکە دەزانین زۆرجـاری وابووە؛ کە دیکتاتۆرێك توانیویێتی دڵی زۆربەی هەرە زۆری گەلێك بـۆ خـۆی رابکێشـێ و وایان لێ بکات بە ئارەزووی دڵی خۆیان پشتی بگرن. زۆر جاری واش بووە کە ڕژێمێکی تۆتالیتێر هێندە کاری کردووەتە سەر زۆربەی هـەرە زۆری گەلێك یان کۆمەڵگەیەك؛ تا وای کردووە لێیان؛ کە باوەڕیان پێ هێناوە و دەنگیان داوە بۆی.

بەڵێ بەپێی ڕژێمی دیموکراتیی بۆرژوازی، مرۆڤ ناچارە "**ڕێـزی گـەل**" و "**ڕێزی زۆرێتی**" بگریت، با ئەو "**زۆرێـتی**"یە زۆربەشی "**بـۆرێـتی**" بێ. چۆنکە "**سەنگ**" لێرەدا هەر ژمارەی (زۆری و کەمی) دەخوێنێتەوە، بەڵام بە پێی سەنگ و تەرازووی بیری ئازادی و یەکسانی، هەموو بڕیارێك دەبێ لە ئازادی دا بدرێ و بۆ ئازادی بدرێ، و هـەر بڕیارێکیش لە دژی ئـازادی بـوو، ئـەوا دیـارە ئـەو بڕیارە لە ئازادی‌دا نەدراوە. چۆنکە ئازادی هاومانای ژیرییە (عقل) و ژیرییش ناتوانێ دژی خۆی بێ. کەواتە ئەوانەی لە دژی ئازادیی خـەڵکێکی دی بڕیـار دەدەن، "لـەژێری"یـەوە ئـەو کـارە ناکـەن. واتـە بڕیارەکـەیان لـە ئازادییـەوە نەهاتووەتـە دەرێ، بۆیـە بـۆ ئـازادی نـەدراوە. لەبـەر ئـەوە ڕێزنـانرێ لێـی، و مەسەلەی ڕێزنان لە ئازادی بە "**زۆری و کەمی**" نی‌یە، چۆنکە مەسەلەی "**ژیـری**" بە "**زۆرو کەمی**" و "**باوەڕ پێ بـوون**" نی‌یـە، و هـەموو جارێکیش "**ژیـری**" لەگـەڵ "**باوەڕ**"دا یەك ناگرنەوە. لەبەر ئەوە هەر "**باوەڕێك**" لە دژی ئازادی بوو، ئەوا لە دژی "**ژیری**"یە، بۆیە هەر بڕیارێك لە رووی ئەو "**بـاوەڕ**"ەوە بدرێ؛ نابێ بایـەخ بدرێ پێی. ئەوجا ئەو بڕیارە "**حکوومەتێکی شەرعی**" داوێتی، یان "**حکوومـەتێکی ناشـەرعی**" ئـەوە هـەروەك یەکە. هیـچ "**شـەرعیەتێك**" مـافی ئـەوەی نی‌یـە "**دژی ئـازادی**" بوەستێ؛ چۆنکـە هـەموو شـەرعیەتێکی کۆمەڵگـەی مرۆڤایـەتی لـە "**ئازادی**"یەوە دەست پێ دەکات.

لەبەر ئەوە کە مەسەلە دێتە سەر ئەفغانستان، مەسـەلە نـە مەسـەلەی ئەوەیـە کە ئایە حکوومەتی بەبرەك شەرعی‌یە یان ناشەرعی، ئایا لەشکری سۆڤێت لـە خۆیـەوە چووەتـە ئەفغانستان یـان بـانگ کـراوە، مەسـەلە ئەوەیـە ئایـە بوونـی

حکوومـەتی بـەبرەك و لەشـکری سـۆڤێت لـە ئەفغانسـتاندا؛ لەگـەڵ بنچینـەی ئازادیی مرۆڤ ڕێك دەکەون، یان لێك دەکەن؟

جا "زانست" دەبێ لەم باری سـەرنجەوە دەست بە پشـکنین و لێکۆڵینـەوە و توێژینەوە بکات و هەر لەبەر ڕۆناکیی ئەم باری سەرنجە بڕیار بدات، نەك لەبـەر ڕۆناکایی "**قانوونی نێو دەوڵەتان**" و "**دەقیی پەیماننامەی ئەفغانستان و سۆڤێت**"، و لە ئەنجامدا دەبێ "**هەڵوێستێك**" پێشان بدات، بەڵام هەڵوێستێك کە لەگەڵ سەنگ و تەرازووی "**ئازادی**"دا جووت بەرامبەر بێ. ئەوانەی خۆیان دەدزنەوە لە پێشاندانی هەڵوێست؛ ئەوانە نەك تـەنێ زانستانە بیر ناکەنەوە، و زانستانە کارناکەن، بەڵکو هەلپەرست و کوڕی ڕۆژن، و هەموو هەلپەرست و کوڕی ڕۆژێك ترسنۆکەو جێی باوەڕ نییە.

بەڵێ... زانست هەڵوێستە نەك بێ هەڵوێستی... هەڵوێستی زانستانەش ئەو هەڵوێستەیە کە لەسەر بنچینەی ئازادی و بۆ ئازادی دەگیرێت.